سەرپەرشتی گشتی
شیرکۆ بیکەس
بەریوەبەری رۆڤار
دلشاد عەبدوللا
سکرتیری رۆڤار
یاسین عومەر
سەرپەرشتیاری هونەری
قادر میرخان
مونتاج
ئاسۆ سەعید

# ژمارەکانی ڕابردووی رۆڤار

| | |
|---|---|
| ١-ئیبراهیم ئەحمەد | ١١-مەستورەی ئەردەلانی |
| ٢-محەمەد مەولود (مەم) | ١٢-مەولانا خالیدی نەقشبەندی |
| ٣-کەمال مەزهەر | ١٣-جەمال عیرفان |
| ٤-لەتیف حامد | ١٤-مەلا عەبدولکەریمی مودەریس |
| ٥-سوارەی ئیلخانی زادە | ١٥-جەلالی میرزا کەریم |
| ٦-محیدین زەنگەنە | ١٦-ئیسماعیل بیشکچی |
| ٧-ئەحمەد هەردی | ١٧-عەبدول خالق مەعروف |
| ٨-یەلماز گۆنای | ١٨-هیمن |
| ٩-محەرەم محەمەد ئەمین | ١٩-حسین حوزنی موکریان |
| ١٠-دلدار | ٢٠-ئەمین فەیزی بەگ |



عبدالقادر محمد سعید احمد
(مەلا قادر)
لەچەند دێڕێکدا:

-١٩٣٧ لە سلێمانی لەدایک بووە.

-١٩٥٩ لە خانەی مامۆستایان دەرچوە بە مامۆستا، لە چەندین پیشانگەی تایبەتو قوتابخانەکاندا بەشداری کردوە.

-ئیستا مامۆستای هونەرە لە

## ژمارەی داهاتوو تایبەتە بە
## نووسەرو وەرگیر
## جەلال تەقی


(رۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك

دەزگای چاپو پەخشی سەردەم هەر دوو مانگ جارێك دەریدەکات

ناونیشان

سلێمانی -فولکەی یەکگرتن -دەزگای چاپو پەخشی سەردەم ڕۆڤار ت / ٣١٢٠٦٩٠

لەدەرەوەی کوردستان Tel: 00441628477660 - Fax: 00441628486008

E-mail.
www.sardam-or\web mail
چاپخانەی (ڕەنج)

# کامەران لە تای شیعری نوێی کوردیدا

**کاکەی فەلاح**

کامەران موکری ناوی محەمەدی ئەحمەدی تەهایەو لە ساڵی ١٩٢٩ز لە شاری سلێمانی، گەڕەکی (دەرگەزێن) لەدایکبوەو خوێندنی تا پۆلی کۆتایی ئامادەییەو لەبەر خەرج و باجی خەباتی نەتەوایەتی نەیتوانیوە خوێندن تەواوبکات و لە نێوان ساڵەکانی ٩٤٩-٩٦٣وە نزیکەی شەش ساڵێك لە بەندیخانە و گرتوخانەو دەستبەسەریدا ماوەتەوە، لە مانگی نیسانی ١٩٧٥دا بە بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کرا بە مامۆستای کۆلێجی ئادابی سلێمانی -بەشی دیراساتی کوردی و ئێستا لێپرسراوی چاپخانەی زانکۆی سلێمانیەو بۆ ئەو ئەرکە تەرخانە. لە شیعردا لەقەبی (کامەران)ی بۆ خۆی داناوەو سەبارەت بەوەیە کە هەرچەندە لە ژیانی خۆیدا کامەرانی نەدیوەو بەڵام لە کاروانی خەباتدا خۆی بە کامەران و بەختیار زانیوەو لە شاعیرانی کوردا زۆرتر سەرسامی (پیرەمێردو گۆران و بێکەس و قانیع)ەو هەریەکەیان تا ڕادەیەك کاری تێکردوە و لە شاعیرانی بێگانەش (تاگور)ی هیندستان زۆر جێگای پەسەندی و کارتێکردنی بوەو ئینجا (لۆرکا)ی ئیسپانی.. لە زماندا عەرەبی و تا ڕادەیەکیش فارسی دەزانێت و لە دانانی شیعردا باوەڕی بە ئیلهام و بە بەهرە هەیە کە بنچینەی شیعرن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بەهرە پەروەردە نەکرێت بە ڕۆشنبیری و خەریك بون و هەوڵدانی تر پێناگات، هەروەك کۆرپەیەك ئەگەر باش پەروەردە بکرێت ئەوا لەش ساغ دەبێت و ئەگەر تورێدرێ ئەوا دەمرێت.. لە بارەی ئیلتیزامەوە باوەڕی وایە هەموو کەسێك خاوەن ئیلتیزامەو ئەوانەش کە خۆیان بە (ناملتزم) دادەنێن ملتەزمن بە ڕچەی نامولتەزمیەوە کە ئەمەش لە ئایدۆلۆژیەتێکی دیاریکراوەوە پەیدابوەو خۆی بە هەستی نەتەوایەتیەوە ملتزمە بەڵام لە بازنەیەکی فراواندا کە هەستی مرۆڤایەتیە، سیمای تازەکردنەوەی شیعری خۆی لە چەند لایەنێکدا دەبینێت، بە تایبەتی لە پارچە بچوکەکاندا، ئەم پارچانە چوارین، پێنجین.. هتد

ئەگەرچی لە ڕوی شێوەوە زۆر کۆنن بەڵام لە ڕوی ناوەڕۆکەوە تازەن، سیمای تازەکردنەوەیان ئەوەیە، وەك خۆی دەڵێت: لە پێش ئەودا لەم چوارینانە کە وتراوە بیرەکەی پەند بوە، بەڵام هی ئەو بە شێوەیەکی گشتی باری سیاسی گرت و بوو بە بروسکەیەك بۆ تێکۆشان -بروسکە بە واتای بەرقیە نەك چەخماخە- هەروەها تەمەن و جموجوڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی کاریان بەسەر زۆری و کەمی بەرهەمەوە هەیە.. بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە شاعیر تا لاو بێت و بەرهەمی زیاتر دەبێت، واتا کە کەوتە ساڵ و تەمەنەوە پەکی دەکەوێت. گۆتە لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا (ڤاوست)ی داناو پیرەمێرد دوو ساڵ پێش مردنی سرودی نەورۆزی دانا.. ئەمە لە ڕوی چۆنیەتی بەرهەمەوە، لە ڕوی زۆریشەوە کەم ناکات.. بەڵام کە دەڵێین بە ساڵاچون بەرهەم کەم دەکاتەوە لەو ڕوەوە ڕاستە کەوا هەندێك باری سیاسی و کۆمەڵایەتی کە لەگەڵ ئەو



تەمەنەدا پەیدادەبن بەرهەم کەم دەکەنەوە، واتا ئەو شاعیرە کە بە تەمەندا دەچێت هەندێك شتی بەسەردێ کە دەبن بە کۆسپ لە ڕێی بەرهەمیدا، کە لەلاویدا یان بەسەری نەهاتوە، یان کاری تێنەکردوە، یان گوێی نەداوەتێ.. تا ئێستە شەش نامیلکەی شیعری چاپکراوی هەیە کە ئەمانەن: دیاری، ئاگرو ژیلە، گوڵ ئەستێرە، گوڵاڵە سورە، زەبری هۆنراوە، ئاوات و ڕەنج، بە پەخشانیش نامیلکەیەکی چاپکراوی هەیە کە دەربارەی ژیانی ئەفسەری جوانەمەرگی لاو بە ناوی (محەمەد قودسی نەمر)ەوەیە[1]. سەرەتای شیعردانانی بۆ ساڵی ١٩٥٤ دەگەڕێتەوە کە هۆنراوەیەکە دەربارەی ئاشتی و دەڵێت:

ئەی کۆتری سپی جوانم
ئەی لەرەی لەحنی ڕەوانم
تۆ دۆستی گشت مناڵانی
ڕەش بێ و سپی، برایانی

دوای ئەم هۆنراوە ساكارەو هەر لە هەمان ساڵدا بۆ مەسەلەی ئاشتی دەڵێت:

بەیانیە
تۆ بخوێنە
ئەی كۆتری سپی نەشمیل
قاچ یاقوتی نەرمی خنجیل
تۆ بخوێنە
بەیانیە
كاتی خۆشی و گۆرانیە
ئاواتمان ئاوەدانیە
ئەی كۆترم ئەی مژدەبەر
تاجی ئاشتیت ناوەتە سەر
ئەم پەنجانە
پەنجەی هەموو
ئەم گەلانە
پەرژینن بۆ ئاشتی بەشەر
با بێ سۆزی ئاشتیانە
لەو چەمانە
لەو كەژانە
بۆ خۆشی و شادمانیە
كاتی خۆشی و گۆرانیە

بەڵام سەرەتای ڕاستەقینەی خۆ خەریك كردنی بە شیعرەوە، وەك خۆی لە پێشەكی نامیلكەی (دیاری)دا دەڵێت /تكاشتان لێدەكەم لە كەموكوڕی نەگەیوی هۆنراوەكانم ببورن، چونكە تازە دەستم داوەتە هۆنراوە دانان، لام وایە هەر ساڵێك و چەند مانگێك دەبێت خۆم پێوە خەریك كردوە/ ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ساڵی ١٩٥٦، بەم پێیە كامەران لە تەمەنی ٢٧ ساڵیدا زمانی شیعری پڕاوەو شوێنەزای فریشتەی شیعریشی (بەدرە)یەو دەستبەسەری.. ئەم هۆی درەنگ شیعروتنەش، وەك بە دەستنوسێكی شاعیردا دەردەكەوێت سەبارەت بەوەیە كە لە پێشەوە تەنها خولیای نوسینی پارچە پەخشانی هونەری و كورتە چیرۆك بوە، تەنانەت لەم بارەیەشەوە لە ساڵی ١٩٤٦دا /پارچە گەوهەرێك/ی وەك پەخشانێكی هونەری لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوكردۆتەوەو لە ساڵی ١٩٥٢یشدا كۆتەرە خەڵوزێ، نانی سیلاوی، ئەم ئینسانانە، لە بیابانێكدا، وەك كورتە چیرۆك لە ڕۆژنامەی (ژین)دا بڵاوكردۆتەوە.. بەڵام گێرەو كێشەی بگرەو بەردەو پاڵەپەستۆی خەرج و باجی خەبات و پیشخواردنەوەو ژیانی ناسۆری و بەشداری كاروانی خەباتی نەتەوایەتی وایان لێكرد كە لە هەناسەی شیعرەوە دەردو زوخاو و بیرو باوەڕی دەرون و مێشكی دەربڕێت.

هەر ئەو هۆیانەش بۆ وایان لە كامەران كرد كە لە شیعردا بابەتی ڕیالیزمی شۆڕشگێڕانەی ئاودراو بە سۆزو هەستی نەتەوایەتی بگرێت بە دەستەوەو بە چالاكی بكەوێتە بەرهەم دانان و گەشاندنەوەی خونچە پاراوەكانی دنیای هەست و هۆش و دەرون.

لە پارچە شیعری /لە زیندانەوە/[٢]، لە دەلاقەو كلاوڕۆژنەی بەندیخانەكەیەوە، لە دەمەی بەهارێكدا شاعیر بە چاوی وردی خەیاڵ كیژ و سەوزەگیاو دەشت و گوڵ و بلبل دەبینێت و بە گوێی تاسەی تینوی یادگار و قاقاو تریقەی نازدار و یادی هاوڕێكانی لە باخچە شیرینەكەی دڵی خۆیدا دەبیسێت و دوور بە دوور سكاڵای ڕاستگۆیانەی حاڵ و باری ژیانی ناو بەندیخانەیان بۆ هەڵدەڕێژێت و زیندان بە ئیسگەی وچان و پشویەكی ناچاری خەبات دادەنێت و سەرلەنوێ چەپكێكی دڵسۆزی و سڵاوی خۆی بۆ خاكەكەی دەنێرێت و ئەو خۆ والێكردنە لە پێناوی نیشتماندا بە مایەی شانازی و سەربەرزی دەزانێت و دەڵێت:

ئاسمان وەكو كەللە بێژنگ
ئاوات ئەبارێنێ بە چنگ
بە چاوی خەیاڵ، دور لە دەشت
كچان ئەبینم دێن بۆ گەشت
سەوزەگیایە، گوڵە، هوزار
قاقایە، تریقەی نازدار
یادی ئێوە هاوڕێینە
لە باخی دڵما شیرینە
نوێنەكەم و قوژبنی ژور
پەنجەرەی بچكۆلانەی سور
پرێمزی دوكەڵاوی
خولیای شێواو و تەماوی
سڵاوتانم لێ ئەكەن هەموو
لە ئێوەو لە كێڵ و مردو
لە ئێوەو لە گردی سەیوان
لە گزنگ و لە ئەرخەوان
ژیانی من، هاوڕێینە
وشكە، بێتامە، خەمگینە
ژیانم وەك یەك گۆرانی
بە شەو هەتاكو بەیانی
بەیانیش تا شەو دێ درەنگ
كە هاوڕێكان ئەبن بێدەنگ
وەك یەك گۆرانیەو بێتام
وەك بەستەی یەكێكی نەفام
سڵاو لە ئێوەو لە قەڵبەز
لە ئەزمڕو دیمەن و ڕەز
زیندان ناخۆشە، تەنگ و مات
گەرچی (وچانە بۆ خەبات)
بەڵام هەر نوێنەو پەڕۆی خوان
زنجیرەكەم و نەختێ نان
هەزار سڵاو لە خاكەكەم
كە خۆمی بۆ وا لێ ئەكەم

بە زمانێكی ساكارو سادە وێنەی هەست و شەپۆلەكانی دەرونی خۆی بەوەی كە تینوی بەهار و جوانیە، دەگرێت و ئنجا وێنەی ڕاستەقینەی ناخی زیندانەكەی و ژیانە تفت و تاڵەكەی دەكێشێت و لە سەلماندنەوە دەگاتە ئەو ئەنجامەی كە بەندیخانە و ژیانی وا ناسۆر قوربانیەكی پێویستە و لە پێناوی نیشتمانیدا دەبێ بدرێت.

وتمان کامەران لە شیعردا ڕێبازی بابەتی ڕیالیزمی شۆڕشگێڕانەی ئاودراو بە سۆز و هەستی نەتەوایەتی گرتۆتەبەر و توانای بەهرەو هونەری خۆی زۆرتر وەك بەرهەم لەو پێناوەدا خەملاندوەو بۆ ئامانجەکانی شیعریش لای وایە کە شیعری تازە دەبێت:

١-لەسەر ئوسلوبی کوردی ڕێك بخرێت، لە چوارین و پێنجین دورکەوێتەوە، وەزنی پەنجە بگرێت، جوت جوت قافیەی هەبێت وەکو هۆنراوەکانی مەولەوی، گۆران.. هتد.

٢-وشەی بێگانەی بە گوێرەی توانا تیا نەبێت.

٣-خۆی زۆر بە قافیەوە نەبەستێتەوە، واتە مانا نەکات بە قوربانی قافیە، قافیە ئەگەر ناچار بوو بکات بە قوربانی مەعنا، چونکە ئەمڕۆ ڕۆژی مانا و زانیارییە.

٤-لەو شتانە بدوێت کە لە ناوجەرگەی کۆمەڵەوە هەڵدەقوڵێت. واتە واقیعی بێت.

٥-لای من وا پەسەندە کە گیانی سەرکەوتن، بەرچاوڕونی و عەزم بەهێزکردن بڵاوبکاتەوەو پێیان بگەیەنێت، نەك پڕبێت لە نائومێدی و گریان و لاڵانەوە.

٦-لە ڕێی وەزن و ڕازاندنەوەو مۆسیقاش بە گوێرەی پێویستی لانەدات.

٧-بوێژ پێویستە لە هەست دەربڕینیدا ڕاستگۆ بێت و ئازابێت، لە قسەی ئەم و ئەو نەترسێت.

٨-پێویستە ئەگەرچی (هەر لە سروشت و دڵداری بدوێت) گیانێکی پاکی ئینسانی نەتەوایەتی هەبێت، ئەم دو گیانەش لە بۆتەی دەرونیدا یەك بخات.

٩-من بە پێویستی دەزانم کە بوێژی تازەی ڕاست و دڵسۆز قینی لە گەلانی تر نەبێت، وە چۆن کوردی خۆش دەوێت هەروا گەلانی تریشی خۆش بوێت/[٣].

ئەمانەن بە کورتی ڕێباز و هەوێن و ئامانجەکانی شیعر لەلای کامەران، ئەمەیشە پوختەی بیرو باوەڕ و هەڵوێستی دەربارەی شیعر و شاعیر پێش ٢٠ ساڵێك.. کە لەوانەیە ئێستا هەندێك لەم خاڵانە، یان بە هەڵە بزانێت، یان ئەمڕۆ قوڵتر بۆیان بچێت.. هەرچی چۆنێك بێت، بە وردی دەست نیشانی ڕێگای ڕیالیزمی شۆڕشگێڕانەی. نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردەواری دەکەن و لەسەر ڕۆیشتن و برەوپێدانی هەمان ڕێچکەو ڕێڕەوی ئەحمەدی خانی و حاجی قادر و سالم و پیرەمێرد و بێکەس و هێمن مهابادییە لە جیهانی شیعری کوردیدا.

تێکرا بەرهەمەکانی کامەران، لە ڕوی بیروباوەڕ و کەرەسەو هەوێن و شەقڵ و بابەت و شێوەوە لەسەر ئەو پێودان و تان و پۆیەن کە بۆ خۆی کێشاون و لەسەریان دەڕوات و وەك شاعیرێکی کوردی نەتەوەخواز شیعرەکانی بە ڕەنگ و دەنگی نەتەوایەتی و خەبات و بزوتنەوەو کارەساتی خۆماڵیانەی سەر بە کورد ئاودراون و ڕازاونەتەوە، بە شێوەو ئوسلوبێکی ئاسان و ساکاری ئەوتۆ دایڕشتون کە هەموو یەکێکی خوێندەوار و نەخوێندەوار تێی دەگەن و چێژی لێ وەردەگرن و کەم و زۆر کاریان تێدەکات بە پێی مەبەست و خواستی شاعیر کە ئەوانی مەبەستەو بۆی داناون:

ئەوی مێژوی کورد بخوێنێتەوە
ئەڵقەی زنجیرەی بهۆنێتەوە
تێ‌ئەگا هەرگیز سەرنانێتەوە
هیچ هێزێك نیە بیتوێنێتەوە
ئەو چەرخە نەما درەختی ڕەگەز
ڕیشەی دەرکێشن، هی ئێمەی نەبەز(٤)

ئەم چەند بەیتە، ئەگەر لە بارەی هونەری شیعرەوە سەرنجی بدەیتێ، وەك بابەت و بیرو قوڵی و شێوەی هونەری شیعر، ئەگەرچی هی سەردەمی سەرەتای شیعر وتنیشە، تا بڵێی ساکار و سادەو لە ڕوەو زۆرتر بابەتی دروشم و ڕاستەوڕاستی بانگکێشان و سەرپێیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەوهەری دڵسۆزی و نەتەوەپەرستی و باوەڕێکی قەناعەتاوی و گەرمیەکی حەماسەتاوی وەك ئاگری تیایە، بۆ نەتەوەیەکی نەخوێندەوار و دواکەوتوی وەکو کوردو لە داروبارێکدا کە چاوی تواندنەوەی لێ زیت بێت، پێویستی دەیخوڵقێنێت و لە کەڵك خاڵی نیەو بەری درەختی ئیلتزامە.. ئەوەتە شاعیر لە پارچە شیعری (ئەستێرەو مەل و خەزان)[٥]دا باوەڕ و ورەو خۆڕاگرتن و بەرچاو ڕونی و سوربون لەسەر ڕێگای خەبات، وەك گەردانەیەك دەکاتە ملی کۆڵ نەدان و بە شێوەی بابەتێکی گونجاو لەگەڵ لایەنی هونەریدا دێتە شیعر و دەڵێت:

ئەو گوڵەی خەزان وەرانی و نەمرد
ئەو دڵەی ناسۆر لە هیوای نەکرد
ئەو پڕیشکانەی دانەمردنەوە
بەڵام هەمیسان گڕیان گرتەوە
ئەو ئەستێرەیەی کشا بۆ ناو چەم
لە سەرەمەرگا خەندەی لەسەر دەم
ئەو مەلەی بای وەشت باڵی هەڵوەران
لە بەستەوتن نەکەوت لە ئاسمان
دان لەناو دڵی منا میوانن
چونکە نمونەی قەت کۆڵ نەدانن

ئەم پارچەیە ئەوەندەی کورتە، ئەوەندەش مەبەست خەستەو بەهرەو هونەری شیعری گرتۆتە خۆی و لە ڕوی دەربڕینی سەرکەوتوانەوە بارە دەرونیەکە ڕاستگۆیانە دەخاتەڕو بەوەی کە گوڵی هەڵوەریوی نەمردو، دڵی پڕ لە هیوای ناسۆر چەشتو، پڕیشکی کوژاوەی لە نوێ هەڵگیرساو، ئەستێرەی بە دەم مەرگەوە بزەدار، مەلی با هەڵوەریوی لە بەستە نەکەوتو کە ئەمانە دەربڕینێکن سەرجەم هەوێنی داهێنانیان تیایەو بۆ مەبەستی شاعیر هاتونە جولەو زمان چەشنە پەیوەندیەکی نەهێنی پێکیانەوە دەبەستێتەوەو ئاراستەی دروست کردنی چەند وێنەیەکی دڵگیرکراون بۆ ڕون کردنەوەی خواست و دەرخستنی بارە دەرونیەکەی. ئەگەرچی من پێم وایە لە باتی وشەی خەزان لە ناونیشانەکەدا گوڵ جێی خۆی بو، هەورەها لە جیاتی بای وەشت، ڕەشەبا، یان تۆف، یان تەرزە.. هتد بەهێزتر بو، چونکە بای وەشت بۆ بارانەو بۆ فەڕ، نەك بۆ هەڵوەرین و کرێوەو وێرانی.

نامیلکەی (دیاری) بە شێوەیەکی گشتی بەرهەمێکی نوێبەرەی دیارییەو بەرەو مەڵبەندی دڵ و دڵداری کراوەتەوەو ناوبەناویش بە بیری نیشتمانی و باس و خواستی هەژار و دەردی کۆمەڵایەتی

ڕازاوەتەوە. بەڵام لە بابەتە دڵداریەکانیشدا جاروبار هەست و دیمەنی داهێنان و نوێ دەبینین کە جیاوازی لەگەڵ هێڵە ئاساییەکەی بابەتی دڵداریدا هەیە:

تۆ بنوارە ئەو کانیە نازدارە
ئێستەش وێنەی هەردوکمانی تیا دیارە
تۆم خۆش ئەوێت، بەڵام نابم بە یەخسیر
لە تاوی قژ، بۆ دڵم بکەی بە زنجیر
نە شوانم بە، نە شوانت بم، بە شمشاڵ
بۆ دڵێکی وشک بکەین پەرو باڵ
نە کڕنوشت بۆ ئەبەم، تۆش بۆ من
با لە باخی شادییا دەست لە گەردن
دو دڵداربین، بە ڕاستی دو فریشتە
ئەو ژیانە بەو جۆرەبێ بەهەشتە
لە گوڵی یاد، لە یادی جوانی ڕەنگین
پێشکەشت بێ چەپکێ گوڵاڵەی شیرین(٦)

ئەم چەشنە خۆشەویستیە کە زۆرتر لە ژیرییەوە نزیکەو کەمتر سۆز و هەستی پێوە دیارە، بابەتێکی نوێیە و شاعیر بە مەرج و ئاگا لە خۆبونێکی وریاییەوە دەچێتە پێشەوە، نە لە تاو قژ خۆی دیل دەکات و نە شوانی و کڕنوشی هیچ لایەکیان پەسەند دەکات و زۆرتر لەو گۆشەیەوە دەڕوانێت کە هەردوکیان مرۆڤن و نرخ و بایەخی مرۆڤانەی تەواوی خۆیان هەیەو تۆزقاڵێك کەم کردنەوە لەو بایەخە دەبێتە هۆی شێواندن و پەلەهاویشتنە سەر ئاوێنەی پاك و بێگەردی ئەو خۆشەویستیە خەیاڵیە کە نیاز وایە بنیات بنرێت:

تازە بویت بە مەلی قەفەس
بۆ چیمە نامە ئیتر بەس
نامەوی من تۆ لەو کورە
داگیر کەم دڵی زۆر پرە
لە خۆشەویستی تۆی شیرین
لە دڵسۆزی، ئەی نازەنین
ئەی گوڵی باخی بێگانە
بەسە ئەم ئاخ و گریانە
نامەوێ لەمەودوا هەرگیز
بگریم وەک هەورەکەی پاییز(٧)

ئەم تورەبون و نارەزایی و ڕق هەڵسانە دیسان بەڵگەیەکی دیکەی دڵداری کردنە بە ژیرییەوە، نەك بە سۆز و هەستی ڕونی دەروێشانەوە، نیشانەی کەم هەوێنی خۆشەویستی و ڕاستی وەفاو پێزانین نیە لە لایەن شاعیرەوە، بەڵکو نیشانەی بیرکردنەوە و دیاریکردنی هەڵوێستی واقیعیانە و ژیرانەیە.. ئەم کە دی خۆشەویستەکەی دڵ و هەست و خۆشەویستی بە لەوێچێك زێڕو سامان گۆڕیەوە و پشتی فەرامۆشی تێکرد و ڕوی کردە بەچکە دەوڵەمەندێك، ئیتر بۆچی پاش ئەو کارەساتە دەبێت نامەی لێ وەربگرێت و وەڵامی بداتەوە و ببێت بە کۆسپی نێوان ئەو دو دڵەی شیرازەی زێڕو سامان بە یەکەوەی نوساندون و لە یەکیان بکات؟ ئەو ئەگەر ئەو بوایە خۆی وەك مەلێك نەدەکرد بە دیلی قەفەزی زێڕین و ئەمی نەدەفرۆشت. ئەبو وەکو مرۆڤێکی خاوەن دڵ و هەست و گیان و بایەخ، ئەگەر ڕاستی دەکرد، هەڵوێستێکی هەبوایەو ئەو کەتنەی نەکردایەو ئێستەش فرمێسکی پەشیمانی نەڕشتایە پاش ئەوەی کە چەرمەکە ئاو بردی و بەرەو خوار بوەوەو لەبەر خۆیەوە بە دەم لێوگەستنەوە بڵێت:

ببوە سامان منی فریودا
منی بە نەختێک ئاڵتون و زیودا
دامی بە کۆشک و بە تەلاری خەم
ئاسمانی شادی گرتم بە ماتەم
من پەشیمانم، ببورە ئەی یار
دڵم مەشکێنە تۆ دڵی دڵدار

بەڵام ئەم خۆشەویستیەی کە بەلای شاعیرەوە بەرزتر و پرشنگدارتر و خوای خۆشەویستی و سەرچاوەی هەست و خۆشیە، خۆشەویستی نیشتمانەو هەموو چەشنە خۆشەویستیەکی تر لەو دەریا قوڵ و بێ سنورەدا شەپۆلی پەلکەزێڕینەن و دێن و دەچن و دەستەملانی یەکترین:

جاران دڵم بە مەئیوسی
دێڕی خەفەتی ئەنوسی
تەرمی زەوقم سست ئەگەڕا
کڵپەی پەژارەم ئەگرا
جاران هەستم تەماوی بو
هەرچیم ئەوت خەماوی بو
لە دەشتی ناسۆریما، هەر
ئەگەڕام وێڵ و دەربەدەر
ئەموت ئاخ بۆ شارەزایە
زاممی سارێژ بکردایە
نە گوڵ بەو ڕەنگە جوانەوە
نە چڵ بەو چرۆیانەوە
نە مۆسیقای شەماڵ، هاوین
نە هاژەی ئاوی کەف زیوین
نە جریوەی مەلی سەرچڵ
نە غەمزەی کچی ڕومەت گوڵ
سارێژیان نەکرد زامی من
برینی جەرگێکی کون کون
تا پەنجەی تۆ، پەنجەی نەرم
سارێژی کرد زامی گەرم
تۆ ئەڵێم: خوای خۆشەویستی
کە سەرچاوەی شادی و هەستی
ئەی خۆشەویستی نیشتمان
تۆ بوی منت کرد شادمان
ئەی گیانەکەم کە تۆم ناسی
ئیتر نەژیام بە کەساسی(٨)

جا ئەگەرچی وەك شاعیرێکی نیشتمان پەروەری پێشکەوتنخوازی نەتەوە خواز، ورد ورد، بە شیعر جێگای پێی کارەساتی خەبات و بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردی هەڵگرتووەو بە بۆنەی ئەو ڕاپەڕین و هەڵمەت و قوربانیانەوە چەند شیعرێکی ڕەنگین و گەرمی بۆ ئەو بزوتنەوانەو بۆ سەرکردەو قارەمانەکانیان هۆنیوەتەوە کە ڕەنگ و بۆن و شیرازەیان بیروباوەڕی گشتی نەتەوایەتیە و تێکڕا کورد بە یەك چاوی مەبەست و نیازی بیرو

سیاسەت تەماشاکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا، ناوبەناو لێرەو لەوێ، ناوی هەژارو جوتیار و پاڵە دەبیستین و دەبینین و تەواو نەبون بە ژێردەست و پێی بیروباوەڕە گشتیەکەوە:

گوێم لە شریخەی لێدانی دارە
قامچی لە پشتی داغان بێزارە
کە من دڵسۆز بم بۆ سزادراو
چۆن بم بە قامچی بۆ ئەو زۆرداره
بۆ ڕەش و ڕوت، چینی برسی
هەرچیەک ئەکەی ناترسی
هەریەک ئۆخەی ئەم میللەتە
نادەم بە هەرچیەک هەتە
هەر ئەوەبو تاوانی من
وتم: کەس مەکەن بە گاسن
هەژار مەکەن بە خشت و بەرد
بۆ کۆشکی بەرزی سور و زەرد
گوێم لێیە لە ورشەی داسا
لە هۆڕەی خاڵۆ هەباسا
جوتیار بۆ خۆتانە شارا
چرای خۆشیتان هەڵکرا
خەلەتان زەرد وەکو ئاڵتون
ئەی برای جوتیار چاوتان ڕون
بۆ خۆتان ئەکەن شەن، درەو
ئاگری ڕۆژ سوتانی شەو
وتم: زۆرداری و خوێن مژی
چەوسانەوە، نابێ بژی
ئەسرینی هەژار ناکەم بە یاقوت
یا سۆزی گریان مۆسیقام نابێ
ژین لەسەر ئەرکی برسی و ڕەش و ڕوت
یا چەوسانەوە، من هیوام نابێ

بەڵێ، وەك وتم، لێرەو لەوێی بەرهەمەکاندا، ئەگەرچی لە چاو خۆیاندا کەمن، ئەم هەناسەو خورپە شیرینانەی دەردی گرانی چەوساندنەوەو هەژار و ڕەش و ڕوت و لێقەوماوی وڵاتەکەو شەقڵی چینایەتی هەن و بە تام و ڕەنگ و بۆن.

ئەوەی کە جێی سەرنج و تێبینیە ئەوەیە کە ئەم شاعیرەمان کۆمەڵێکی زۆری شیعری شێوە (چوارین) هەیەو بایەخێکی تایبەتی بەم تەقەلایە داوەو پێوەی خەریك بوەو تەڵ تەڵ وەك چڵە نێرگس تێکەڵاو بە چەپکە گوڵی نامیلکەکان کراون و لەوانەش بەشێکی زۆری هەڵبژاردەی بە ناوی (گوڵاڵە سورە)ەوە پێشکەش بە باخچەی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی کردوە.

گوڵاڵە سورە، هەر بە ناوەکەیدا دیارە کە بیروباوەڕی سیاسی و خوێن گەرمی و هەڵچون و داچونی ڕێگای خەباتی نەتەوایەتیەو ڕەمزی جوانەمەرگی و قوربانی و سەرەتای بەهار و ژیانەوەو گەرمیە. ئەوە بوو خۆی لە مەرجەکانی نوسین و شیعر و شاعیریدا بیروڕای وا بوو کە شیعری تازە دەبێت ١-لەسەر ئوسلوبی کوردی ڕێك بخرێت.. لە چوارین و پێنجین دورکەوێتەوە.. هتد کەچی بە پێچەوانەی ئەوەوە دەبینین لە تەقەلای ئەدەبی خۆیدا بایەخێکی دیار و بەرچاوکەوتوی بەم لایەنە داوە.. دەبێت هۆی ئەمە چی بێت؟ هەندێك لە نوسەرو ڕەخنەگران، بە تایبەتی دکتۆر کامیل بەصیر ڕای وایە، کە کامەران /لە شیعردا ئارەزوی پارچەی بچوك دەکات و لە هۆنینەوەی قەسیدەی درێژ دور دەکەوێتەوە.. لەم بارەیەوە خۆی ماندودەکات تا ئەو پارچانە لە شێوەی چوارین و پێنجین و بەیتابن، بەم ڕێگایە، لەناو شاعیرە هاوچەرخەکانی ئەمڕۆی کورددا تاك و تەنیایە.. بەلای ئێمەوە ئەم دیاردەیە لە خۆیەوە نەهاتوە، بەڵکو سروشتی بابەتە شیعرییەکان دروستی کردون، چونکە شاعیر بابەتی سیاسی لە دەوری پاشایەتیدا وەرگرتوەو کەس نەیتوانیوە بە ئاشکرا دەم لە سیاسەتەوە بدات. جا ئایا لە داوبارێکی وادا شاعیر دەتوانێت قەسیدەی درێژی لەو بابەتانە بڵێت؟ کێ بۆی بلاودەکاتەوە، چۆن دەچێتە ناو خەڵکەوە؟.. کەواتە وەك دەڵێن.. پێویستی دایکی داهێنانە، بۆیە شاعیر پەنای بردۆتە بەر ئەو شێوەی چوارین و پێنجین و بەیتانە تا بیروباوەڕی سیاسی و سۆزی نەتەوایەتی خۆی بکات بە شیعری بروسکەو کورت و گوێ وەك پەلەی لاسلکی وەری بگرێ و دڵ لەبەری بکات و لێو لەبەر خۆیەوە بیڵێت و بیڵێتەوە بێ ئەوەی چاو پێی بزانێت(٩)/.

ئەم ڕایە ئەگەرچی لە ڕاستی بێبەش نییە، بەڵام هۆی تریش هەیەو زۆرە کە نەهاتۆتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە ئەم بابەتە کە لە بابە تایەری هەمەدانیەوە هەیەو کەموزۆر شاعیرانی کورد، چەرخاوچەرخ و پشتاوپشت، وەك ڕێگایەکی لاسایی کردنەوە، بەرهەم و تاقیکردنەوەیان هەیەو گەرمیان و کوێستانیان پێکردوە. ئەم بابەتە چوارینانە، زۆرتر بیری ڕاگوزاری و چەخماخەی بیروهەست و کەم ئەرکی شیعر و خۆماندونەکردن و زوو



کامەران لە زینداندا-١٩٤٨

بەدەستەوەدان دروستیان دەکات، چونکە پێم وایە، زۆرتر هەر شاعیر و ڕەخنەگری شارەزاو بە سەلیقە دەزانێت، هەتا شاعیر دەتوانێت قەسیدەیەکی دوورودرێژی خاوەن بابەت و ناوەڕۆك گۆشتن و بەهرەدار و بەپێز بڵێت، دەتوانێ بە دەیان پارچەی کورتی چوارین و پێنجین لەو بابەتانە بڵێت.. ئەمە لە سەرێکەوە، لە سەرێکی تریشەوە، تێکڕا ئەو بابەتە چوارینانە، وەك بیروباوەڕی سیاسی و کاروباری بیرو ژیری، هەر تەواو شەقڵ و ڕەنگی ساکاری و ڕاستەوخۆیی و دەقاودەقی و مەبەست و ڕون و ئاشکراییان پێوە دیارەو زۆر کەمتر هەوێنی هەست و سۆز و خەیاڵ و پەلکەزێڕینەی ڕەنگاوڕەنگی مۆسیقاو ئاوازو کێش و وێنەو دەربڕینی هونەرمەندانەو دەنگی چەشناوچەشنی جیاوازیان لە خۆیان گرتوەو لە هەموویان و لەسەر حسابی هەموو ئەم گەوهەرە پرشنگدارانەی شیعر، زیاتر لەنگەری بایەخ لەسەر بیرو فەلسەفە ڕاگیردراوە کە ئەمیش گەوهەرێکی سەرەکی شیعرە، بەڵام هەموو هەوێن و گەوهەرەکان نیەو بە ئاوێتەکردن و ڕەنگدانەوەی هەموو ئەمانە شیعری هونەری لە بابەتی هۆنراوەو نوسین و وتاری سیاسی و پەخشانی کورتی کۆمەڵایەتی جیادەبێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا و سەرباری هەموو ئەوانەش، وەك لە پێشەوە وتم، بۆ شاعیرێکی ژێر سێبەری درەختی ئیلتیزام و بۆ نەتەوەیەکی نەخوێندەواری دواکەوتوی وەکو کورد و بۆ گەرم کردنی کوڕەی دەرونی خەبات و ڕاپەڕین، وەك دەستەچیلەو چاوگی نەوتاوی، ئەم بابەتە چوارینانە، بەو گەرم و گوڕی حەماسەت و جۆش و خرۆشانەوە، لە گۆشەی خۆیانەوە، کە گۆشەی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتین، ئەرکی ڕەوای سەرشانی خۆیان بەجێهێناوەو بەجێ دەهێنن.. لەم ڕووەوە، گوڵاڵە سورەو هاوبابەتەکانی دیکەی نامیلکەکان لە دەشت و چیای خەبات و چاوکردنەوەدا جێ جێ سوردەچنەوەو مایەی نرخ و بایەخی شیاوی خۆیانن:

کڕێوەی ناسۆر، لە کێوی ژینا
لە گیان و دڵی بێ هێزو تینا
لول ئەخوا، لەناو دەمی برینا
گریەم دێتە گوێ لە نەغمەی بینا
بەڵام بەستەی غەم لە دەمم نایە
گۆرانیم تەنیا نەغمەی هیوایە(10)
توانەوەی سەهۆڵ گەشانەوەی گوڵ
لەرەی شێنەیی گەڵاو پۆپی چڵ
بە تەنیا گەرمی و جۆش نادەن بە دڵ
کاتێ دڵی من ئەگەشێتەوە
کە بەفری خەمی کورد بتوێتەوە(11)
ئاگر بە نەختێ ئاو کوژایەوە
گوڵ بە بای پایز سەری نایەوە
بەڵام ژیلەمۆی تێکۆشانی کورد
دوای هەزاران ئاو هەڵگیرسایەوە
گوڵاڵە سورەی جوانی ئازادی
دوای خەزانی زەرد هەر گەشایەوە(12)

ناوبەناو، ئەگەرچی زۆر کەمە، چەشنە بەرهەمێکی دەکەوێتە بەرچاو، بەڵام گیانی داهێنانی تیایەو لەو هەوێنە بێبەش نیە کە ئەویش دەربڕینی هونەرمەندانەیە لە ڕێگای تابلۆی هەستەوە بە تێکەڵاوکردنی مۆسیقای جیاواز و دەربەست نەبونی بەندو کۆتی قافیەی ناڕەوا لەسەر حسابی ناوەڕۆکی مەبەست و هەستی شاعیر. ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە خۆبەستنەوەی تا کۆتایی بە یەك کێش و ئاواز و بە یەك ڕەنگ قافیەوە، سەربەستی پەل بزاوتنی تەواوی شاعیر دەتاسێنێت و لە باتی ئەوەی بە هونەری دەربڕین و ڕازاندنەوەی وێنە تابلۆی هەستەکەوە خەریك بێت، ناچارە بەشێکی زۆری ڕەنج و تەقەلای خۆی تەرخانی لەسەر ئەو کێشە دەرنەچون و دۆزینەوەو خۆبەستنەوەی تەواو بەو یەك قافیەییە، یان قافیەدارییە، بکات و ئەرکەکە لە ڕادەی بەهرەو هونەری وێنەو دەربڕین و تابلۆی هەستەوە بێتە خوارەوە بۆ سەر پلەی سنعەتکاری و پیشەگەری وردەکاری زمان و لەبز و وشەسازی.

ئەم دیاردەیەش زۆرتر بە گەشی لە شیعری ئەی کچە شوان، ئەمڕۆ تینومە، شەپۆلی زێڕ، جیمی ولسون، شوشەی شکاودا دیارە:

ئەی کچە شوان
ئەم چەم و دەشتە شیرینە
ئەم چیاو دۆڵە ڕەنگینە
تا دوێنێ بۆ
لیت و لێشاو بۆ تەپ و نم
گیانی گوڵان بون ئەوەرین
وا تۆوی گوڵ بوژایەوە
گوڵی مردو ژیایەوە
لە گوێ ئاوی قەڵبەزی کەڕ
دڵۆپ هەڵئەستێ وەکو پەڕ
یا وەک پەپولەی ناسکۆڵە
بە تیشکی گزنگ زەرد و سور
بڕوانە ئەو شەوبۆ وردە
لەسەر ئەو تاوێرە بەردە
فریشتەی هیوا بگرە کۆش
بە ناسۆر تۆ مەبە سەرخۆش
بابێ
دەنگی شمشاڵەکەت
لەرەی بێ لێوە ئاڵەکەت
بە ئاوازی کامەرانی
نەرم نەرم
زۆر بە جوانی
گەردن هەتاو
ئەگریجە خاو
ئەی کچە شوان(13)

سەرنجێکی سەرپێیی لەم شیعرەی سەرەوە ئەوە دەسەلمێنێت کە شاعیر ئەوەندەی دەربەستی وێنەو دەربڕین و تابلۆی هەست و دەروون یەك بە دەی ئەوە دەربەستی قافیەو یەك ئاوازی و وشەسازی و پیشەگەری شیعر نەبوەو زۆرتر هونەر و بەهرە

خەریکی کردوە و لەنگەری پێگرتوە و هێناویەتی لەگەڵ خۆی. ئەگەرچی ئەم بایەخ و گوێ پێدانە وردە وردە کاڵ بوەوە تا وای لێهات لەم چەشنە دیاردەو ڕواڵەتانە بە بەرهەمە دواییەکانی وەك ئاوات و ڕەنج، زەبری هۆنراوەدا نیەو نەمان.

بابەتێکی تریش هەیە کە کامەران فەرامۆشی نەکردوەو بە پێی بزواندن و ڕاچەنین و پێویستی هەستی جوڵاوەو دڵی بۆی لێداوە کە ئەویش بابەتی مرۆڤایەتییە لە شیعردا و بەشداری بزوتنەوەی گەلانی ڕوی زەمین و مەسەلەی ئازادی و ئاشتی برایەتی نێوان گەلانە.. ئەم بەرهەم و هەنگاوانەش، سەرەتا بە وەرگێڕانی پارچەیەك شیعری ئەنتۆنیۆ ماخادوی –کە بە بۆنەی دەستڕێژکردنی شاعیری گەورەو جوانەمەرگی ئیسپانیا (لۆرکا)ی نەمرەوە داینابو، بۆ شیعری کوردی بە ناوی (ڕوبەڕوی مردن)ەوە[١٤]، پارچەیەکی تریش هی لۆرکای شاعیر خۆیەتی بە ناوی (قورتوبە)ەوە[١٥] بۆ شیعری کوردی، دەستی پێکرد و ڕوی کردە دانانی پارچە بە سۆزەکەی (جەمیلە)[١٦] وەك ڕەمزێکی سەرسەخت و کۆڵ نەدەرانەی شۆڕشە مەزنەکەی گەلی قارەمانی جەزایر و وەرگێڕانی شیعرێکی (پۆل ئیلوار) بە ناوی (کورنیکا)وە[١٧] کە دەربارەی ژیان و ئاشتی و ئازادی و برایەتی هەموو گەل و وڵاتانی سەرزەمینە کە تێدەکۆشن بۆ ڕۆژێك مرۆڤی ڕەش و سورو سپی و زەرد یەك دڵ لەژێر سێبەری ئاشتیدا بژین، و (سرودی سەرکەوتن)[١٨] کە بۆ شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژەو بۆ گرێدانی برایەتی نێوان کورد و عەرەب و کەمایەتیەکانی وڵاتەکەمانەو بۆ پاراستنی ئازادی و ئاشتی و سەربەخۆیی. پارچە شیعری (جیمس ویلسن)[١٩] کە دەربارەی ژیان و خەبات و هەڵوێست و دادگای مرۆڤێکی کرێکارو زەحمەتکێشە. لەگەڵ (گیڤارا)[٢٠] و (لۆمۆمبا)[٢١] بەم شیعرانەی بەشداری کاروانی خەبات و برایەتی گەلان و هەموو مرۆڤایەتی کردوەو لە دوا شیعردا دەڵێت:

گوڵە مینای زەردە خەنەی ناسک وەری بو
باڵی وشەی خۆش و بە تام سڕ بو، تەزی بو
لێو وشکی خەم، چاو بە تیری سام پێکرا بو
دڵ بە چنگی زەبری سزاو ناسۆر گوشرابو
مناڵ سنگی ئەوەندەی دی شەقار شەقار بو
مەمکی دایکی لەبەرچاو کەوت، لە شیر بێزار بو
پشکۆی گەشی گوندی سوتاو کوڵمی مناڵ بو
نیلە نێڵی ئاگر تێکەڵ بە گڕوگاڵ بو
پەنجەی زۆردار لە کوشتنی مناڵ و دایکا
کارامە بۆ نیشانەکەی یەکسەر ئەپێکا
کاتێ گوللەی ڕۆڵەی کونغۆش کە گیزەی ئەهات
جوڵە نەبو، بەرەی دوژمن خاو و کش و مات
پەڕەی وردی نێرگس لێوسیس بو، ژاکابو
لێوی وشەی تەڕو ناسک پێکا لکابو
گوڵ ئەگریاو دوا دڵۆپی شەونمی ئەڕشت
بۆ ئەو کوڵمەی خۆڵەمێش بۆ لەسەر ڕوی ئەنیشت
بە ژیلەمۆو بە دوکەڵی کوڕپەڵەی سوتاو
ئەپۆشرا بەری چاوی کەژاڵی هەتاو
لەناو گەروی سزاو مردنا
بە دیلێتی، یا لە کۆڕی خوێناو ڕشتنا
ڕەنجبەرەکان لە زەلکاو و لە دارستانا
لەگەڵ قرچەی گەرمای هاوین، کزەی زستانا
ڕەنجبەرەکان بە برسێتی و ڕوتی و نەبونی
شەونخونی و سزاکێشان، کزی و زەبونی
ڕەنجبەرەکان لەو کاتەدا ئەکران بە نیشان
بانگیان ئەکرد: بژی شۆڕش، بژی تێکۆشان(٢٢)

سەرجەم لە شیعری کامەراندا، لە ناوەڕۆکدا دەنگی خەباتی نەتەوایەتی و بیروباوەڕی نەتەوەخوازی و پێشکەوتن و هیواو خولیاو گەشبینی هەیە، زۆر بە دەگمەن بابەتی یەئس و نائومێدی و دڵشکاوی هەست پێدەکرێت، وەک:

کام ئاواز خۆشە، یان کام گۆرانی
بەهەر جۆرێک بێ پاراوی خەمە
کام بەستە جوانە، بۆ کامەرانی
هێشتا شێوەکەی هەر هی ماتەمە
سرودەکانم پڕن لە سۆزی
گریان و ناڵە و ئازارچەشتنی
شیعرەکانیشم هەر بە ئاڵۆزی
تەنیا ڕیز ئەبن بۆ خەم ڕشتنێ
زرەی کۆت لەناو دەرون و گیانا
زۆرجار مەچەکی ئارام ئەبەستێ
هۆنراوەی جوانم لە پێدانان
لەتاو خەم جارجار لەپڕ ئەوەستێ
زۆر وشەی جوان و گەشی وەک ئاگر
لە دڵی منا بون بە ژیلەمۆ
زۆر شیعری گەرم و شیرین و نەمر
بە دیل گیراون، وەکو من و تۆ(٢٣)

شیعرەکان بە زمانێکی کوردی پەتی و کوردیەکی ڕەوان و تەڕو پاراو گەشاونەتەوە، لەسەر تانوپۆی کێشی فۆلکلۆری نەتەوایەتی و خۆماڵی سفت و سۆڵ چنراون و گیانی ئاواز و مۆسیقایەکی خۆش و فێنکیان بە بەردا کراوەو وێنەو دەربڕین و هەست و هۆش و سۆزیان لە خۆیان گرتوەو لە خوێندنەوەدا جۆش و خرۆش بەخش و دڵگیرن. لە وردبونەوەو بەراورد و تێبینیدا دەردەکەوێت کە ڕەنگێکی کوردەواری و تایبەتی خۆماڵییان پێوە دەدرەوشێتەوەو تێکرا لە باسی جل و بەرگ و هەڵپەڕکێ و کەرەسەی ڕاوو شکار و ناوی گوڵ و مەل و دیمەنەکانی سروشت و بەهاری ڕازاوەو مێژوی کورد و بزوتنەوەی نەتەوایەتی و ناوی قارەمان و کارەسات و بەسەرهاتە مێژوییەکان و وشەو کەرەسەو دەربڕین و داڕشتن و وێنەو گیان و ئاوازدا کوردین و سەرو سیمای کوردەوارییان بە زەقی پێوە دیارەو دەنگ و ڕەنگی ئەم خاك و ئاو و هەوایەیان تیا تواوەتەوە لە دەوروبەری مرۆڤی کورددا وەك پەپولەی وێڵ بە تاسەوە دەخولێنەوەو دەگەڕێن.

ئەوەش کە مایەی پرس و داخی خوێنەرانی کوردە ئەوەیە کە بۆچی کامەران، لە زەبری هۆنراوەوەو لە ساڵی ١٩٧١وە نە لە شێوەی نامیلکەو دیوان دا و نە لە ڕێگای ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکانەوە هیچ دەنگێکی نیەو لە شیعروتن کەوتوەو ئایا ئەمە سەبارەت بەوەیە کە بەرهەمی هەیەو بڵاوی ناکاتەوە، یان



سەرچاوەی بەهرەی شیعروتنی وردە وردە کزو کەم ئاو بوەو وشکایی داهاتوە، بە تایبەتی ئەگەر زانیمان کامەران، لە هەموو ژیان و تەمەنی شیعریدا، ئەگەر بەرهەمی بو بێت، هەرگیز ئەوەندە بێدەنگ نەبوەو دانی بلاونەکردنەوەی بە خۆیدا نە گرتوە.. بەڵگە ئەوەیە کە لە ساڵی ١٩٥٧دا نامیلکەی (دیاری) و لە ساڵی ١٩٥٨دا ئاگر و ژیلەو لە ساڵی ١٩٥٩دا گوڵ ئەستێرەو گوڵاڵە سورەو لە ساڵی ١٩٦٨دا ئاوات و ڕەنج و لە ساڵی ١٩٧١دا زەبری هۆنراوەی گەشاندۆتەوەو ناوبەناویش لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا شتێکی هەر بلاوکردۆتەوە. ئەگەرچی خۆی لە وەڵامی ئەم پرسە بەجێییەدا دەڵێت: شیعری بلاونەکراوەم زۆرە، بەڵام نامەوێ وەك زۆر لەمەوپێشیش نەمویستوە لە ڕۆژنامەو گۆڤاردا بلاویان بکەمەوە، ئەمەوێ لە دەرفەتێکدا بە شێوەی کۆمەڵە هۆنراوە = دیوان چاپیان بکەم/[٢٤].

جا ئەگەرچی شیعروتن، یان نەوتن مافێکی سروشتی و ڕەوای هەموو شاعیرێکەو بە دەست خۆیەتی بیڵێت یان نەیڵێت، بلاوی بکاتەوە، یان نا، بەڵام وا ئێمە لێرەدا لەسەر زمانی خۆیەوە ئەم حەقیقەتی بونی شیعری بلاونەکراوەیەمان تۆمار کرد و لەگەڵ چاوی تاسەی ئەم و ئەودا چاوەڕوانی بەرهەمی نوێ و بلاونەکراوەی شاعیر دەکەین.

**پەراوێزەکان:**

١-لە نامەیەکی شاعیر خۆیەوە.
٢-ئاگرو ژیلە.
٣-دیاری- ل ١٢.
٤-هەمان سەرچاوە- ل ١٤.
٥-هەمان سەرچاوە- ل ٤٧.
٦-هەمان سەرچاوە- ل ٢٣.
٧-هەمان سەرچاوە- ل ٤٠.
٨-هەمان سەرچاوە- ل ٦٦.
٩-کامران شاعر من کردستان- کامل حسن البصیر- السلیمانیة مطبعة کامران.
١٠-گوڵاڵە سورە- ل ٦.
١١-هەمان سەرچاوە- ل ١٠.
١٢-هەمان سەرچاوە- ل ١٦.
١٣-دیاری- ل ١٨.
١٤-هەمان سەرچاوە- ل ٣٣.
١٥-هەمان سەرچاوە- ل ٣٧.
١٦-ئاگرو ژیلە- ل ١٠.
١٧-هەمان سەرچاوە- ل ٢٣.
١٨-هەمان سەرچاوە-= ل ٦٢.
١٩-گوڵ ئەستێرە- ل ٦٥.
٢٠-ئاوات و ڕەنج- ل ٧١.
٢١-زەبری هۆنراوە- ل ٤٧.
٢٢-زەبری هۆنراوە- شیعری لۆمۆمبا- ل ٤٨.
٢٣-ئاوات و رشەنج- ل ٥.
٢٤-لە نامەیەکی شاعیر خۆیەوە.

**سەرچاوە:**

کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگی یەکەم، کاکەی فەلاح، چاپخانەی حسام- بەغداد- ١٩٨٠، لا ٣٣٣-٣٥٤.

## چەند نمونەیەك لە شیعرەكانی
## كامەران موكری

### ئەستێرەو مەل و
### خەزان

ئەو گوڵەی، خەزان، وەرانی و نەمرد
ئەو دڵەی، ناسۆر، لە هیوای نەكرد
ئەو پڕیشكانەی، دامردنەوە
بەڵام هەمیسان، گڕیان گرتەوە
ئەو ئەستێرەی كشا، بۆ ناوچەم
لە سەرەمەرگا، خەندەی لەسەردەم
ئەو مەلەی، بای وەشت، باڵی هەڵوەران
لە بەستە وتن، نەكەوت لە ئاسمان
وان، لەناو دڵی، منا میوانن
چونكە نموونەی (قەت) كۆڵ نەدانن

## یاد

قـــــژی نــــــەرمت، وەکـــــو تــــاڵی خۆرەتـــــاو
لەســــەر قــــۆڵ و شــــانی ســـپی، پـــەرش و خـــاو
نەغمـــەی شــیرینی، ئــاوازی خــۆش لــــە دەنگــا
ورشــــەی ســـــەرنج، لـــــەناو چـــاوێکی مــــەنگا
خـــاڵێکی کـــاڵ، نەخشـــێکی جــوان، لەســـــەر ڕوو
بـــــەژن و بــــالآت، وردیلـــــەو ڕێکـــــو هــــەڵچوو
زەردەخەنـــــەی ئــــەو ڕووە، هـــــی ئـــــەو لێـــــوە
فریشــــتەی هەســــت، هــــی ئــــەم دڵــــە بزێـــــوە
وا، لێ ئــــــەکات، بێتــــــە ســــــەماو گۆرانــــــی
بیلـــــــەرزێنێ تـــــــەلی ئـــــاوازی جوانـــــی
درەختەکــــەی، ســــەر کانێکــــەی، بــــاخی چـــەم
پـــێ ئەکـــەنێ، گـــەڵای ئـــەڵێن، پــــڕ بــــە دەم
لــــە بیرمانــــە، منـــــاڵ بـــــوون، لـــــەناو باخـــا
زەردەی دەمتــــان، ئـــــەدا بــــە پشــــتی داخـــا
تـــــۆ بنـــــوارە، ئـــــەو کانیـیــــە، نـــــازدارە
ئێســــتەش وێنـــــەی هـــــەردووکمانی تیـــا دیـــارە
تـــۆم خـــۆش ئـــەوێت، بـــەڵام نـــابم بـــە یەخســـیر
لــــە تـــاوی قـــژ، بـــۆ دڵـــم بکــــەی زنجـــیر
نەشـــوانم بـــە، نـــە شـــوانت بم، بـــە شمشـــاڵ
بـــۆ دڵێکـــی وشـــک، بکـــەین -پـــەڕو بـــاڵ_
نـــە کوڕنوشـــت بـــۆ ئەبـــەم، نـــە تـــۆش بـــۆ مـــن
بـــا لـــە بـــاخی شـــادیا، دەســـت لـــە گـــەردن
دوو دڵـــدار بـــین، بـــە ڕاســـتی دوو فریشـــتە
ئـــەو ژیانـــە بـــەو جـــۆرە بێـــت بـــە هەشـــتە
لـــە گوڵـــی یـــاد، لـــە یـــادی جوانـــی ڕەنگـــین
پێشکەشـــت بێـــت چـــەپکێک گوڵاڵـــەی شـــیرین

## فریشتە

ڕوومــــــەتی وەک گوڵــــــی بێگــــــەرد
قــــــژی خــــــاو، ئاوریشــــــمێکی زەرد
چــــاوی کــــاڵ، ئەگــــەرچی نەرمــــە
بــــەڵام نیگــــای ئێجگــــار گەرمــــە
بــــاڵای وا، دەمێکــــی وا تــــەنگ
ئــــەندامی ئــــاوا شــــۆخو شــــەنگ
نــــەبووە،.. یــــا مــــن نــــەمدیوە هــــەر
لــــەو چەشــــنە بــــەژن، یــــا کەمــــەر
لــــەو ڕەنگــــە کوڵمــــی گــــەش و ئــــاڵ
لاملێکــــی وا جــــوان و کــــاڵ
جوانێکــــە تــــاک، وەک فریشــــتە
ئــــاخ وەســــفی مــــن، زۆر درشــــتە
کــــوا شــــیعرێک ورد، خــــۆش و گــــەرم
وەک ئــــەندامی لەشــــی.. نــــەرم
کــــە شــــین ئەپۆشــــێ وەک ســــاماڵ
وەک مانگــــە، لــــە ئاســــۆی خــــەیاڵ
مــــن هــــەر ئــــەوەندەم لــــە دەس دێ
کــــە دێــــت وەک کــــەو، تێپــــەڕ ئــــەبێ
پێشکەشــــی کــــەم، یــــەک هەناســــە
پــــڕ، لــــە پەرســــتن، لــــە تاســــە



ئەوی هەر بۆ خۆی بژی ئەمرێ بەڵام ئەوی
ژیانی بۆ گەل تەرخان کا لە دڵی گەلا ئەژی
بۆت ئەڵێم لە دێڕی شیوەن
دوور، لە وردەکاری و لە فەن
کام وردەکاری، کام هونەر
هەڵبەستی جوانی وەك گەوهەر
ئەتوانێ وەسفی تۆ، هەرگیز
بنێتە، سەر قاغەز بەڕیز
باسی دڵ، هی ئەو دەروونە
ئەو بیروباوەڕە ڕوونە
ئەی کۆچ کردووی مەشخەڵ هەڵگر
ناتوانم بیکەم بە شعر.
خۆزگە فریشتەی شیعری گەش
بە دڵ ئەیگرتم بە باوەش
ئەیبردم بۆ لای خوای وتن
دێڕی جوانی ئەدا بە من
چەند دێڕێك ورد، بۆ یادی وا
ئاگر، لە ناخی دڵ بەردا
ئەی شیخ مەحموودی شانازی کورد
هەموو بە جارێ گەورەو ورد
فرمێسکت بۆ، ئەڕێژین.. دڵ
بۆ، کۆچی تۆ، هاتۆتە کوڵ
با نمی ئەشکی (کوردستان)
لەجێی مەدالیای قارەمان
بکەین بەو سنگە پانەدا
"لە سۆزی ئەم گریانەدا"
ئەڵێم و هەر وتوومە.. هەر!
ئەی گەورەکەمان، ئەی سەروەر
زیندانەکانی هیندستان
"خۆڵەمێشی گەرووی بازیان"
خوێناوی چەمی کەناروێ
زامنی دوژمن کە دێتە سوێ
ئاوبارێکی دابێژراو
بە گوڵلەی دەسڕێژی بەتاو
ئەتناسن گەورە کۆچ کردو
ئەی تێکۆشەری نەمرود

**

گەورە پیاوەکەی نیشتمان
هەمیشە زەردەخەنەی جوان
لەسەر لێوی وەك زیوی خاو
یا وەك گزنگی خۆرەتاو
بریسکو هەوری بوو، شیرین
وەکو نیشانەی نەبەزین
لە دەربەندی بازیان کە هات
کڵپەی ئەسەند گڕی خەبات
بەتاو، کە هێرشی ئەبرد
ئەینرکان و بانگی ئەکرد
مردن بۆ گەل شانازی‌یە
دڵم بەو مەرگە ڕازی‌یە
"ئەستێرەی ئادەمی نشین[٢]
لەجێی خۆی وەرگەڕێ بەتین
پەراش بێ لە تەما[٣]
(ئەوسا، من ئەڵێم کورد نەما)
کورد بۆ ئازادیی وەتەنی
خۆی ئەکا بە سووتەمەنی
-گیانی من کە نەختێ گەردە-
-بۆچی نەیبەخشم بەم کوردە-
لەناو قووڵی دەروونەوە
لەو دڵە پاکە ڕوونەوە
دەنگی ڕزگاریی کوردستان
ئەهاتە دەرێ و ئەینرکان
بانگی ئەکرد: ژیان بۆ کورد
ئەمرین و ئەڵێین (گیان بۆ کورد)
لەبەر فرمێسکی لێڵ و خوڕ
خامەکەم هەرچەند هاتە گوڕ
نەیتوانی بنووسێ پتر
بۆ یادی کۆچ کردووی نەمر
هەر ئەوەندە بڵێم مەگەر
گیانی پیرۆزی تێکۆشەر
(ئەوی ئاڵاکەمان پێ‌دا)

(وا لە ناو دڵی ئێمەدا)
ئێستە لە یاد، بۆی ئەچنین
وێنەیەکی جوان و شیرین
ئاخۆ، کەی بێ کورد لە گەوهەر
لە یاقووت بۆی بکا پەیکەر

ئەم هۆنراوەیە لە ساڵی ٢٥٦٩ی کوردی مانگی ڕەزبەرا ١٠/١٠/١٩٥٧ی زایینی- لە ڕۆژنامەی (ژین)دا بە تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر کۆچی دوایی شێخ مەحموودی گەورەی نەمردا بڵاوکرایەوە..

ئەو وشانەی لە هۆنراوەکەدا نیشانەیان لەسەر:

١-خوای وتن- (خوای شعر وتن).

٢-ئەستێرەی ئادەمی نشین (یەعنی ئەرز).

٣-پەراش پەراش بێ لە تەما- ئەوسا من ئەڵێم کورد نەما

یەعنی ئەگەر هاتو (ئەرز) لە (محوری خۆی) وەرگەڕا! وە پەراش پەراش بوو، وە ئادەمیزاد تەفروتونا بوو (خوانەکە ئەوسا مەگەر کورد نەمێنێ.. یەعنی کورد نامرێ، هەرگیز نامرێ.

## چەند نمونەیەك لە شیعرە وەرگێڕاوەکانی کامەران

### ڕووبەڕووی مردن



*له ساڵی (١٩٣٦)دا له کاتێکا که (لۆرکا)ی بوێژی هەرە گەورەی (ئیسپانیا)یان برد بۆ کوشتن "دەسترێژ". ئەنتونیو ماخادۆی بوێژی گەورەی (ئیسپانیا) کە لە نەفی بوو ئەم هۆنراوەیەی بۆ ووت!*

سەرنجماندا، ئەرۆی بێ دەنگ
لەم لاو، لەو لایەوە.. تفەنگ
بەرەو دەشتی، پڕ شنە شن
لەژێر پەردەی، ئەستێرەچن
لەوێ، نزیک ئاسۆی ڕووناک
کوژرا، بە تفەنگی... ناپاک
چاویان لێکنا، پیاوکوژەکان
ملیان کەچ، سەریان دانەوان
زاتیان نەبوو، تێی بنواڕن
سەرنج بەن، لە چاوی، گەردن
بە دەم نوێژەوە، ورتەیان
بە پەردەی گوێی، ژینی گەیان
-تازە، ڕزگارت ناکا خواش-
-تازە، ڕزگارت ناکا خواش-

**

رومەت، خویناوی، گوللەی رەش
پەراسوویان، گرتە باوەش
مردو، تاوانیکی گران
رووی دا، لە شاری بەسزمان
بەسزمان.. (فرناتە)ی شیرین
زۆر بەسەزمانە.. ئەیزانین!!

**

دیمان، ئەرۆی، لەگەڵ مەرگا
(ورە)، مەلاس، لەناو جەرگا
نەترسا، لە داسی مردن
لە زەبری، بەتینی کوشتن

**

رۆژ لە تەلارەوە.. دەسگا
چەکوش بە گور خۆی پیائەدا
دەنگی بە سامی لی ئەهات
-لۆرکا-ش، لە ریی مەرگ و خەبات
لەگەڵ مردنا.. ئەدوا
گویی لی‌بوو.. دەنگی هەلئەسا
(هاوری هەمووی هەر دوینێ بوو
شەمال خۆی لە درەخت ئەسوو
گەلای دار خورما ئەیچرپان
بوو، بە تەرزە بەستەکەمان
بە داسیکی تیژی زیوین
دەسو پیی پەژارە -پەرین)
بەم جۆرە -بەستە ئەلیم من
بۆ ئەو لەشەی بەردی مردن
بۆ ئەو بەژنەی هی تۆ نەبوو
هی گەل بوو، ئەی برای زیندوو
بۆ ئەو قژەی پەرشی رووە
بۆ لیوی ئال کە نوستووە
بۆ ئەو دەمەی لەمەوپێش دەم
ئەی مەژی.. خۆشەویستەکەم
چەند خۆشە، من ئێستە.. تەنیا
لەگەڵتا بوومایە.. برا
ئەی گیانی (غرناتە)ی ئازیز
بیرمان ناچێتەوە هەرگیز

**

دیمانن، ون ئەبوون لە چاو
بۆ ناو شەپۆلی خۆرەتاو

هاوڕێینە: لەناو بەردا
لە خەوی گەشو بێ گەردا
قووڵ.. لە کۆشکێکی ڕەنگ ئاڵا
لەناو بەردا.. لە خەیاڵا
لەژێر کانییا.. قوڵە قوڵ
کە ئاوی ڕوون، ئەگری بە کوڵ
گۆڕێک هەڵکەنن، بۆ شاعیر
بۆ (لۆرکا).. بۆ گیانی نەمر
ئاوی کانی ئەگری بەخوڕ
تا ئەبەد ئەڵێ و دڵی پڕ
(لە غرناتە جورمی گران
وەک درنج هەستایە سەرپیان!).



# من ڕەشم

من ڕەشم وەکو کینییا
ئەمرم لە ڕێی ئازادییا
وەکو ڕەنگی شەوێکی ڕەش
یا وڵاتی منی بێ بەش!
وەک جەرگی ئەفەریقاکەم
نیشتمانە.. بێ نەواکەم
ڕەنگم ڕەشە، پێستم ڕەشە
ئەم دەنگە هی قولە ڕەشە:
جاران کۆیلەیەک بووم هەژار
بەر دەرگانەی کۆشکی زۆردار
ماڵی (قیصەر)م، ئەماڵی
ژینم بەسەربرد بە تاڵی
من بووم، بۆیاخچی دوور وەتەن
قۆندەرەکانی واشنتەن
لەکۆشما بوو، هەر منیش بووم
بە هێزی دەماری بازووم
بە عەرەقم، بە خوێنی گیان
بنچینەی کۆشکم هەڵئەسان
(هەرەم) بناغەی من دامنا
بەردم ئەدا، بە سەرشانما



ئەم هەڵبەستە هی بوێژی ئەمریکی ( ماك كريا )یە

قوربانی یەک بووم لە (کۆنغۆ)
بەلچیکێکان بێ (شەرموشۆ)
دەستیان، قرتانم، لە بنا
دەست ڕۆیشتون لە کوشتنا
ئێستەش لەناو کینیاکەما
لە دارستان و ناوچەما
گوللەبارانم ئەکەن هەر
منی ڕەش، منی دەربەدەر
منی ڕەش، منی دەربەدەر
بەخرکە بەردی (تەکساسیان)
کەوتوونە (دووم) بە بەردباران
زۆر، ڕووبارم دیوە بە خوڕ
لە هاژە هاژا، تاوی گوڕ
(نیل)ی بزورگی دڵنیا
لەناو قووڵی بێ دەنگیا

سەرنجی داوم، زۆر بە دڵ
جار جار بۆ من هاتۆتە کوڵ
ئاوی (مسیسیپی)شم دیوە
کە جار جار پێم پێکەنیوە
یان بە دڵ بۆ من گریاوە
بەگوڕ لافاوی هەستاوە
وەکو ڕووی ئەو ڕووبارانە
لۆچ لۆچ و پیر بوو ئەم گیانە
بەرام من ئینسانم، ئینسان
وەکو ئێوە دەمارو گیان
من ئازادیم ئەوێ هەرگیز
بۆی بەختە گیانی (قول) بەڕیز
من ڕەشم وەکو کینییا
ئەمرم لە ڕێی ئازادییا



## چەند شیعرێکی هەمەچەشن

**کامەران موکری**

هەرچی درەختە گڕی تێبەردەن
پەپوولەی هیوای من ناسووتێنێ
بای پایز هەمووی بە جارێ هەڵکەن
ئەم خونچە وردەی من ناوەرێنێ
چۆن ئەوە ڕۆژە ئەیبینم هەڵات
ئاواش دڵنیام ئەگەین بە ئاوات

ئەڵێم خۆزگە لە جیاتی خوێن دەمارم ئاوی تیا بوایە
لەناو جەرگەی بیابانا لەپڕ یارم پەیا بوایە
لەبەر تەڕکردنی لێوی، بە بێ پەروا لەبەر دەمیا
بە نووکی خەنجەرێ خوێنی دڵی خۆم بۆ بڕشتایە
(لە ئینگلیزییەوە)

هەرچیم کردووە لێی پەشیمان نیم
هەر زوو ئەمزانی وا هەژار ئەبم
لەگەڵ خەباتا من بێ پەیمان نیم
ئەمزانی تووشی سەد جەخار ئەبم
چونکە لەلای من تەنیا قوربانی
بەژین ئەبەخشێ ڕووناکی و جوانی

لام وایە نزمی بۆیە سەربەرزی
بە زێڕ دائەنێ پێوەی ئەنازی

تام نییە بگا بە هی دڵداری
ئازاریش نییە وەکو ئازاری
تا نمی ئەشکی دڵت نەڕێژی
تامی خونچەی دەم هەرگیز ناچێژی
لەلای من عەشق و دڵداری چیایە
لە دوور سەد دیمەنی شیرینی تیایە
بەڵام کاتێ کە دڵ کەوتە نزیکی
ئەبینێ دەردو ئەندێشە و سزایە

لە ئاسمانی سەربەرزییا هەزاران
بوون بە هەور خوێنی خۆیان ئەباران
لەسەر کەژی ڕزگارییا کوڕی شەنگ
چنگی گیرکرد لە گەردنی شەوەزەنگ
لەوێدا بوو بە دەستی خۆی، خۆی سووتان
لەبەر تۆ بوو، بوو بە (ڕۆژی) کوردستان

کوردێک کە ئەچووە بەردەمی قەنارەکە
ئەمەندە مەرد بوو، ئەو بە مردنی ئەووت دەڕامەکە

دڕکێ بم لەژێر تاوێری بەردا
لە گەردی چۆڵا، دەوەنی هەردا
گەلێ خۆشترە، گوڵاڵە بم من
لە ئینجانەدا هەڵم وەرێنن

هونەری جوان، زانست هەمووی بە جارێ
ئێوە ئەیکەن بە قوربانی دیناری

ئەگەر ژێرکەوتوو ئەسرین نەڕیژێ
سەرکەوتوو تامی زاڵ بوون ناچێژێ

هەور بوومایە نمێ بارانم
دەغلی زۆرداری نەئەگرتەوە
ئاسمان بوومایە ئەستێرەکانم
ورشەی لە قەڵای زوڵمی نەئەدا
بەم باوەڕەوە ژینم بردەوە

# سیمای داهێنان لە هۆنراوەکانی کامەراندا

د.دڵشاد عەلی

**پێشەکی:**

زۆربەی ئەو لێکۆڵینەوەو نوسینانەی کە دەربارەی (کامەران)ی شاعیر و هۆنراوەکانی بڵاوکراونەتەوە، هەوڵی ئەوەیان داوە کە دەوری کامەران لە بزوتنەوەی نوێخوازی قۆناغەکەیدا دیاری بکەن، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە گەلێ بیروڕای جیاواز دەربارەی هۆنراوەکانی بە تایبەتی و دەربارەی شەقڵی بزوتنەوەی نوێخوازی ئەو قۆناغە بێنە ئاراوە. بێگومان ئەو باسانەش بۆ خۆیان سودمەندن و کەم و زۆر لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەدەبەکەماندا جێگای خۆیان گرتووەو دەشبنە بنەمای لێکۆڵینەوەی تر، بەڵام بە گشتی نەبوونی چەمکێکی دیاریکراوی ئەو بزوتنەوە نوێخوازییەی کە مەبەست بوە لە لایەك و یەکالا نەکردنەوەیەکی تەواوی تاقیکردنەوەی هۆنراوەیی لای کامەران لە لایەکی ترەوە بۆتە هۆی ئەوەی کە لەگەڵ ڕووەوە ئەو باس و لێکۆڵینەوانە ئەنجام بە دەستەوە نەدەن و زۆر لایەنی ئەو تاقیکردنەوەیە هەر بە شاراوەیی بمێنێتەوە.

جا بە نیازی خەملاندنی تێڕوانینێکی کامڵ دەربارەی تاقیکردنەوەی هۆنراوەیی کامەران و دیاریکردنی هەندێ شەقڵ و سیمای داهێنان لە بەرهەمەکانیدا بەو لێکۆڵینەوەو نووسینانەدا چوینەتەوەو لەگەڵیشیاندا بۆچوونی خۆمان خستۆتە ڕوو، بە گشتیش باسەکەمان کردوە بە سێ بەشەوەو لە هەر بەشێکدا چۆنیەتی و ڕادەی هەنگاونانی کامەرانمان لە جیهانی هۆنراوەی کوردیدا دیاریکردوە.

**هەنگاوی یەکەمی کامەران و دیوانی (دیاری)یەکەی:**

پێش بڵاوبوونەوەی یەکەم دیوانی کامەران لە ساڵی (١٩٥٧)دا کە دیوانی (دیاری)یە، کامەران خۆی باس لەو پارچە هۆنراوانەی دەکات کە جاروبار لە هەندێ بۆنەدا لەدایك بوون، بە تایبەتی ئەو هۆنراوانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ ساڵی (١٩٥٤) و پەیوەندییان بە بڵاوبوونەوەی هۆنراوەی ئاشتیخوازیەوە هەبوە، ئەمە جگە لەو هۆنراوانەی کە ناوبەناو لە گۆڤاری هیوادا بڵاوی کردونەتەوە، پارچەیەکیش لەو هۆنراوانە ئەم چوارینەیەی بوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٥٥) و دەڵێ:[1]

بیکەرەوە دەرگای ڕەشی زیندانت
دایڕێژە کۆتی قورسی گرانت
شورە بکێشە لە پەنجەو بازوو
لەناو خوێناوا شوورەکەت ڕۆچوو

ئەم پارچە هۆنراوانەش تا بڵاوکردنەوەی دیوانی (دیاری) بە تەواوی کامەرانیان وەك شاعیر نە بە خۆی و نە بە خوێنەرانیش نەناساندبوو، هەربۆیە دیوانی (دیاری)یەکەی بە هەنگاونانی کامەران دەزانین لە جیهانی هۆنراوەی کوردیدا.

بە گشتی دیوانی (دیاری) کە کامەران خۆی لە پێشەکییەکەیدا دەڵێ: "تازە دەستم داوەتە هۆنراوە دانان لام وایە هەر ساڵێك و چەند مانگێك دەبێت خۆم پێوە خەریك کردوە"[2] نەك هەروەك کۆمەڵە بەرهەمێکی هۆنراوەیی ئەو قۆناغە سەرنجی خوێنەرانی ڕاکێشاوە بەڵکو هیوای بەرەوپێش چوونێکی بێ سنوریشیان تیادا بەدی کردوە.

(مارف بەرزنجی) بۆ ئەوە چوە کە (کامەران): "هەروەك خۆی دەڵێ بە ڕاستی زۆری داناوەو زۆرەکەش بۆر نیە ڕەنگینە.. لە بابەتا شاگردێکی پێگەیشتوی مامۆستا گۆرانە، کەمێکیش پرتەوی هەردی لە هەڵبەستەکانیدا دیارە، بە تایبەتی لە سۆزی ناسۆری دڵداری لێ تێکچووی بە هۆی خاوەن تەلار و زێڕەوە"[3].

بەلای (محمد صدیق عارف)یشەوە "کامەران یەکێکە لە شاعیرەکانی هەنگاوی سێهەمی ماوەی گوێزانەوە، هەنگاوی سێهەمیش ئەو هەنگاوەیە ئێستا پێدا تێدەپەڕێ، لە مامۆستا گۆرانەوە دەسپێدەکات، بە دوای ئەم شۆڕشەی گۆراندا چینێك شاعیری گەنجی خوێن گەرم لە ئاسۆی هۆنراوەی کوردییەوە سەریان دەرهێنا کە یەکەم و زووربەیان کەم و زۆر ئەو شۆڕشەی گۆران کاری تێکردوون و دوەم بە بیروباوەڕێکی نوێوە هاتنە



کامەران لەگەڵ د.دڵشاد

کـۆڕەوە، هۆنراوەکانیـان لـە (ئایدۆلۆجیـەتێکی) تایبەتیـەوە هـەڵ دەقوڵێ بۆ مەبەست و ئامانجێك دەنووسن"[٤].

هـەر لـەم ڕووەوە (د. عـیزەدین مسـتەفا ڕەسـوڵ)یـش دەڵـێ: "کامەران بە تازەکەرەوە دانانرێ نە لە هێنانە ناوەوەی بیروباوەڕی نـوێ و نـە لـە ڕوخسـاری نوێـدا، بـەڵکو هـەندێ لـەو بیروبـاوەڕە نەتەوەیی و نیشتمانی و مرۆڤایەتیانە دەردەبڕێ کە پێش ئەم و لە کاتی ئەمدا کۆمەڵێ شاعیری تری سەر بە هەمان بیروباوەڕی کامەران دەریان بڕیبوو، ڕوخسارە هونەرییە تازەکەش بریتی بوو لـەو ڕوخسـارە داهێنـەرەی کـە پـیرەمێرد و گـۆران ئـەنجامیان دابوو"[٥] ئەم بۆچوونانە خۆیـان ڕووبەڕوی سـێ خـاڵی گرنگمـان دەکەنەوە:

یەکـەم: بنـەماو سـەرچاوەی تاقیکردنـەوەکانی شـاعیر و چۆنیەتی ئەنجامدانی دیوانێکی وەك (دیاری) لە ماوەیەکی کورتدا بێ ئەوەی بێهێزی بە هۆنراوەکانیەوە دیاربێ.

دوەم: ڕادەو چۆنیـەتی ئـەو پەیوەندیـەی کـە لـە نێـوان هۆنراوەکانی کامـەران و ڕێبـازی نوێـی هۆنـراوەی ئـەو قۆناغـەدا هەبوە لە لایەك و پەیوەندی بە بەرهەمەکانی (گۆران)ی شاعیرەوە کە ڕابەرێکی هەرە دیاری ئەو بزوتنەوە نوێخوازیە بوە لە لایـەکی ترەوە بەو پێیەی هەرسێ نوسەرەکەی پێشوو هێمایان بۆ کردوەو هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە بیروڕای تـرو پێچەوانـەی ئـەو بۆچونانە لەلای نوسەرانی تر سەرهەڵبدات.

سێیەم: دەنگە تازەکـەی کامـەران و تاقیکردنەوەی هۆنراوەیی کامەران.

بێگومـان تـا خـاڵی یەکـەم و دوەمیـش یـەکالا نەکرێتـەوە بـە تـەواوی ناتوانرێ تیشکێکی تـەواو بخرێتـە سـەر خـاڵی سـێیەم و سیمای داهێنان لە هۆنراوەکانیدا دیاری بکرێت، لێرەشدا چەمکی داهێنـان بـەلای ئێمـەوە ڕێبازکردنـەوە ناگەیـەنێت بـەڵکو ئـەو شـەقڵانەی داهێنانە کـە زۆر جـار و لـە ئـەنجامی مامەڵـەکردنێکی نـوێ لەگـەڵ تاقیکردنـەوەو کەرەسـەی بنیاتنـانی هۆنـراوەدا سەرهەڵدەدات.

دەربـارەی خـاڵی یەکـەم و دوەم سـەرەتا ئـەو بـاری سـەرنجە دەخەینـە ڕوو کـە تـۆوی لـەدایکبونی هۆنراوەکـانی نـاو دیوانـی (دیاری)یەکەی کامەران جگە تاقیکردنەوەی خودی شاعیر خۆی و ئاوێتـەکردنی ئـەو تاقیکردنەوانـە بـە تاقیکردنـەوەی کۆمـەڵانی خەڵکەوە، هەندێ بەرهەمی ئەدەبی بونەتە تۆوی تاقیکردنـەوەی چەند پارچـە هۆنراوەیـەکی نـاو ئـەو دیوانـە. یـەکێ لـەو پارچـە هۆنراوانەش (پەنجەی تەزیو)ە کە تیایدا دەڵێ:[٦]

لەپاڵ دیوارێکدا، خەمگین
دائەنیشێ اهیوا)ی شیرین
ئەندامی ورد لەشی گەردن
هەموو لەگەڵ یەک ئەلەرزن
دوای هەناسەیەک دەس گێڕان
لە کونوقوژبنی گیرفان
نەختێ شقارتە دەردێنێ
یەک یەک دایان ئەگیرسێنێ

ئەم هۆنراوەیە بە هەموو بیرو وێنەو دیمەنەکانیەوە ڕاستەوخۆ لە چیرۆکێکی (هانس ئەندەرسن)ەوە وەرگیراوە کە بە ناونیشانی (لە شەوی جەژندا)یەو کاتی خۆی لە گۆڤاری گەلاوێژدا کراوە بە کوردیو[٧] باس لە کچە هەژارێکی شقارتە فرۆش دەکات کە لە ئێوارەیەکی ساردی زستاندا بەرامبەر کۆشکێکی ڕازاوەو ڕونـاك هەڵدەتروشـکێ و لـە سـەرماندا دەنـك دەنـك شـقارتەکانی دادەگیرسێنێ و خۆی پێ گەرم دەکاتەوە.

هـەر لـەم ڕوانگەیـەوە ئەگـەر بمانـەوێ ڕادەی پـەیوەندی هۆنراوەکانی کامەران لەو هەنگاوە سەرەتاییەیدا بە بەرهەمەکانی (گـۆران)ی شـاعیرەوە دەربخـەین ئـەوا هـەر زوو ڕووبـەڕوی چـەند هێڵێکی دیاری ئەو پەیوەندیە دەبینەوەو ڕاستەوخۆ چەند پارچە هۆنراوەیـەك خـۆی دەخاتـە بەردەسـتمان کـە لـەژێر کاریگـەری هۆنراوەکانی (گۆران)دا لەدایك بوون.

لـە (بووکـی لادێ)دا کامـەران لایـەنێك لـە لایەنـەکانی چەوساندنەوەی جوتیارانمان دەخاتە بەردەم و سەرەتا بە چەند دێڕێك باس لە چۆنیەتی ڕازاندنەوەیەکی کچە جوتیاری شۆخ و شەنگ دەکات کە بە بووکی بۆ کوڕی جوتیارێکی دەبن، لە پاشدا دێتـە سـەر باسـی ئـەو پیلانـەی کـە ئاغـا بـۆ کوشـتنی کـوڕە جوتیارێکی دەخات و کوڕە جوتیاری پێ لەناودەبەن:[٨]

بووک خرایە ڕێ بۆجوتیار
لەم زنجەوە بۆ ئەو دەوار
هەر دوای دو سێ مانگی تر
بەربوو لە گیانی بەگ ئاگر
پیلان تاڵ تاڵ چنیان بۆی
زۆر ڕێگەو شوێنی دانا خۆی

بەم جۆرە ئەم تابلۆیە هەر هەمان تابلۆی هۆنراوەی (بوکێکی ناکام)ەکەی (گۆران)ە و تەنها جیاوازییەك کە لە نێوانیاندا بەدی بکرێ لەوەدایە کە لە (بوکێکی ناکام)دا هەر لە سەرەتاوە ئاغا کچە جوتیار لە کوڕە شوان داگیردەکات و بەرەو کۆشکی ئاغا دەخرێتە ڕێ دوای ئەوە ئینجا پیلانی کوشتنی کوڕە شوان ڕێکدەخرێت[٩]. لە کاتێکدا لای (گۆران) جوانی سروشت بێ بزەی ئازیز و جوانی ئافرەت لاسەنگ دەوەستێ و دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە بڵێ:[١٠]

بەڵام تەبیعەت هەرگیزاو هەرگیز
بێ ڕووناکیە بێ بزەی ئازیز

لای (کامەران) و لە هۆنراوەی (جوانی بەهار)ەکەیدا هەمان بیر بـەدی دەکـرێ و لای ئـەمیش بـاش پیشـاندانی تـابلۆی جوانـی سروشت لە بەهاردا بە نزیکەی بیست دێڕێك ئینجا دەڵێ:[١١]

کیژۆڵەی نازدار ئەم دەشت و چەمە
لارولەنجەی تۆ بزەی تۆی کەمە
ورشەی کراست کە بێ لەم دەشتە
ئەوساکە ئەڵێم باخی بەهەشتە

لە هۆنراوەی (جارانم)دا (کامەران) ئاوڕ لە ڕابردوو دەداتەوەو باس لە ژیانی شێواو و دڵی تەنگ و پەژارەو ناسۆری ئەو ڕۆژە ڕابردووانە دەکات تا دێتە سەر ئەوەی کە پەنجەی خۆشەویستی زامەکانی ڕابردووی ساڕێژ دەکات و سەرچاوەی شادی دەتەقێنێتەوە، خۆشەویستیەکەش لێرەدا خۆشەویستی نیشتمانەو دەڵێ:[١٢]

جاران دڵم بە مەئیوسی
دێڕی خەفەتی ئەنووسی
تەرمی زەوقم سست ئەگەڕا
کڵپەی پەژارەم ئەگررا

نە گوڵ بەو ڕەنگانەوە
نە چڵ بەو چرۆیانەوە
نە مۆسیقای شەماڵ، هاوین
نە هاژەی ئاوی کەف زیوین
نە جریوەی مەلی سەرچڵ
نە غەمزەی کچی ڕوومەت گوڵ
ساڕێژیان نەکرد زامی من
برینی جەرگێکی کون کون
تا پەنجەی تۆ، پەنجەی نەرم
ساڕێژی کرد زامی گەرم

هەر ئەم تابلۆیە بۆ خۆی هەمان تابلۆی (نیان)ەکەی (گۆران)ە، تەنها جیاوازییەکیش کە سەرنجی خوێنەر ڕابکێشێ ئەوەیە کە تەمی مەینەت لابەرەکە لای گۆران جوانی و خۆشەویستی ئافرەتە ئەگینا وێنەکان بە هەردوو دیویانداو لە هەردوو پارچە هۆنراوەکەدا بە تەواوی وەك یەکن، (گۆران) لە (نیان)ەکەیدا دەڵێ.[١٣]

سەردەمێک بوو دنیای گیانم تاریک و چۆڵ بوو
تام (بەرۆچکەای گەرمە دڵم چەشنی سەهۆڵ بوو
* *
سەردەمێک بوو نە تریفەی مانگی هاوینم
نە گزنگی هەتاوی سەر لوتکەی بەفرینم
نە لەرزینی چینی سەر ڕووی گۆماوی شینم
نە بریقەی دووری چەمی پاش زۆر بارینم
نە ورشەی گیای مێرگی سەوزی دەم و بەهارم
نە شنەی بای دارستانی چڕی نزارم
چەشنی جاران دای ئەخورپان ناخی دەرونم
ئەیهێنایە سەر هەڵقولین سەرچاوەی ڕوونم
* *
لەو ڕۆژەوە دیومە سیحری زەردەخەنەی تۆ
دنیای دەروون مەلەکانی هاتونەتەوە گۆ

جگە لەم هۆنراوانە، هەندێ تابلۆو وێنە هونەرییەکانی (گۆران) لە هەندێ پارچە هۆنراوەی دوای دیوانی (دیاری)یەکەی کامەرانیشدا بەدی دەکرێ، بۆ نمونە ئەو وێنانەی کە لە هۆنراوەی (بۆ گەورەیەکی شیعر دۆست)ی (گۆران)دا دەبینرێ بە تەواوی لە (تۆسقاڵێك لە دڵم)ی کامەراندا ڕەنگیان داوەتەوە.

سەرەڕای ئەو تێڕوانینانەو هەر لە سنوری لێدوانماندا دەربارەی خاڵی دوەم، کاتێك ئاوڕ لە لێکۆڵینەوەکەی (کاکەی فەلاح) دەدەینەوە، سەرەتا ئەوەی کە سەرنجمان ڕادەکێشێ ئەوەیە کە بەلای (کاکەی فەلاح)ەوە: "کامەران لە شیعردا ڕێبازی بابەتی ڕیالیزمی شۆڕشگێڕانەی ئاودراو بە سۆز و هەستی نەتەوایەتی گرتۆتەبەر"[١٤] بێگومان ئەم چەمکەی ڕیالیزم کە (کاکەی فەلاح) دەست نیشانی دەکات بۆ خۆی ئەوە دەگەیەنێت کە هۆنراوەکانی کامەران سەر بە ڕێبازی ڕیالیزمی سۆشیالیزمی نییە، هەر بۆیە بە لایەوە ڕێچکەکەی (کامەران): "برەوپێدانی هەمان ڕێچکەو ڕێڕەوی ئەحمەدی خانی و حاجی قادر و سالم و پیرەمێردو بێکەس و هێمن مهابادییە لە جیهانی شیعری کوردیدا"[١٥] لێرەداو وەك دەبینرێ لەگەڵ ئەو کۆمەڵە شاعیرەدا ناوی (گۆران) ناهێنێت، ئەم تێڕوانینەش زۆرجار و بێ مەبەست خوێنەری بەرەو دوو هەڵەی گەورە بردوەو تا ئێستاش لای هەندێ ئەدەب دۆست بەدی دەکرێ، یەکەمیان: دورخستنەوەی (گۆران) ڕێچکەیە وەك ئەوەی (گۆران) نە هۆنراوەی نەتەوایەتی هەبووبێ و نە دڵسۆزی نەتەوەکەشی بووبێ، دوەمیان: دورخستنەوەی کامەران و هۆنراوەکانی کامەران لە مەیدانی خەباتی چینایەتی، هەر بۆیە بەلای (کاکەی فەللاح)ەوە لای (کامەران): "ناو بەناو لێرەو لەوێ ناوی هەژار و جوتیار و پاڵە دەبیستین و دەبینین و تەواو نەبوون بە ژێردەست و پێی بیروباوەڕە گشتییەکەوە"[١٦].

لێرەداو هەروەك (د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) دەڵێ: "کەسانی هوشیار لە قاوغی یەکگرتوی یەك نەتەوەدا چینە جیاوازەکانی ناو نەتەوە دەبینن"،[١٧]. دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە (کامەرانیش ئەوەندە هوشیار بوە کە نەك هەر چینە جیاوازەکانی ناو نەتەوەکەی دەبینی بەڵکو ئەوەندە هەستی بەو جیاوازییە چینایەتیە کردوە کە دەیزانی کامەیان دڵسۆزترن، هەر بۆیە لە دیوانی (دیاری)یەکەیدا هۆنراوەکانی (کچە شوان) و (پەنجەی تەزیو) و (بوکی لادێ) و (میوەی نازدار) و (پەشیمانی) و (هێلانەی ئارام) و (پەنجەی ژیان) و (گۆرانی من) و (ڕەهێڵە) و (کچەکەی خۆی) و سەرجەمی هۆنراوەکانی دیوانی (گوڵاڵە سورە) و زوربەی هەرە زۆری هۆنراوەکانی تری ناو دیوانەکانی کامەران

ئاوێنەیەکی بێگەردی کێشەو گیروگرفت و خواست و هیواو ئاواتی مرۆڤی چەوساوەن و دەنگی بیری پێشکەوتنخوازانەی کامەرانە کە هیچ کاتێ لایەنە چینایەتییەکەی کەلا نەخستوەو وەك لایەنێکی کێشەی میللەتەکەی مامەڵەی لەگەڵدا کردوە:[١٨]

ئەی خاڵۆ گیان من ڕەنجبەرم

بۆیە ئێجگار کورد پەروەرم

با هەر گۆرانییەکەی جاران

بڵێینەوە بۆ کوردستان

ئەو کەسەی لە مردن ترسا

لە کاروانی خەبات جێما

لە ڕاستیدا ئەدەبی کوردی وەك ئەدەبی هەموو میللەتێکی تری دنیا شەقڵ و سیمای تایبەتی خۆی هەیەو ئەو ڕێچکە جۆراوجۆرانەی کە لە ئەدەبی میللەتاندا بەدی دەکرێ مەرج نییە لەلای ئێمەش ئەو ڕێچکانە دروست بووبێت.

(د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) بە وردی ئەوەی ڕون کردۆتەوە کە: "کێشەی نەتەوایەتی بنکەی ڕێبازی ڕیالیزمی کوردییەو ئەدیبە کوردەکان وەك یەکەم کێشەی میللەت مامەڵەیان لەگەڵدا کردوە" و "ئەدیبانی سەر بە ڕێبازی ڕیالیزمی سوشیالیزمی لە شێوازی مامەڵە کردن و خستنەڕوی کێشە نەتەوایەتییەکەدا لەگەڵ ڕیالیستە سوشیالیزمەکانی تردا جیاوازیان هەبوەو لای ئێمە بەستراوەتەوە بە ڕێبازی شۆڕشگێڕێتی جیهانییەوە"[١٩]. هەر لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە لە ئەدەبی کوردیدا ناتوانرێ بەرهەمی ئەدیب و شاعیرانی کوردی ئەو قۆناغە بەسەر چەند ڕێچکەیەکی ڕامیاریدا دابەش بکەین چونکە بیروباوەڕی ڕامیاری ئەدیب و شاعیرانی کورد خۆیان هەرچییەك بووبێت ئەوا بەرهەمەکانیان هەر لە سەریەك ڕێچکە بوە کە ڕێچکەی ئەدەبێکی نیشتمانی پێشکەوتنخواز بوەو دەنگیشیان دەنگی میللەتەکەیان و دەنگی بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازی و شۆڕشگێڕێتی بوە.

دوای گەیشتن بەم ڕاستیانە کە دەگەڕێینەوە سەر دیوانی (دیاری)، ئەوا بە ئاسانی پەردە لەسەر ئەو پارچە هۆنراوانەش هەڵدەدرێتەوە کە بۆ خۆیان سیمای داهێنانیان تیا بەدی دەکرێ، هەر ئەم پارچە هۆنراوانەش بوون کە سەرنجی خوێنەران و ئەدەب دۆستانی ئەو کاتەیان ڕاکێشاوەو بە گەرمیەوە باوەشیان بۆ گرتۆتەوە. یەکێ لەو پارچە هۆنراوانەش کە لێرەدا دەیهێنینەوە یاد (یاد)ەکەی ناو دیوانی (دیاری)یە کە تیایدا دەڵێ:[٢٠]

قژی نەرمت وەکو تاڵی خۆرەتاو

لەسەر شان و قۆڵی سپی پەرش و خاو

نەغمەی شیرین، ئاوازی خۆش لە دەنگا

ورشەی سەرنج لەناو چاوێکی مەنگا

* * *

درەختەکەی سەرکانێکەی باخی چەم

پێدەکەنێ گەڵای دەڵێن پڕ بە دەم

لە بیرمانە مناڵ بوون لەناو باخا

زەردەی دەمتان دەدا بە پشتی داخا

تۆ بنواڕە ئەو کانیە نازدارە

ئێستەش وێنەی هەردوکمانی تیا دیارە

تۆم خۆش دەوێت بەڵام نابم بە یەخسیر

لە تاوی قژ بۆ دڵم بکەی زنجیر

نەشوانم بە نەشوانت بم بە شمشاڵ

بۆ دڵێکی وشک بکەین پەڕوباڵ

نە کورڕنوشت بۆ ئەبەم نە تۆش بۆ من

با لە باخی شادیا دەست لە گەردن

دوو دڵدار بین بە ڕاستی دوو فرشتە

ئەو ژیانە بەو جۆرە بێت بەهەشتە

لە گوڵی یاد لە یادی جوانی ڕەنگین

پێشکەشت بێت چەپکێک گوڵاڵەی شیرین

بەلای (مارف بەرزنجی)یەوە ئەو هۆنراوەیە "شیعرێکەو دەڵێی مامۆستا گۆران وتویەتی، وێنەیەکی دڵداری تیا دەرخستوە کە بۆ ئەمرۆ دەس دەدا کە لە سەربەستی و یەکسانی هەردوولاو سەرکەوتنی هۆش بەسەر عاتیفەدا پێکهاتوە"[٢١]. بە پێچەوانەی ئەم بۆچونەی (مارف بەرزنجی)یەوە ئەم هۆنراوەیەی (کامەران) وەك نمونەیەك لەو هۆنراوانەی کە کەم و کوڕیان تێدایە لە لایەن (محمد صدیق عارف)ەوە خراوەتە ڕوو، بەلای ئەمەوە هۆنراوەی (یاد) لەو هۆنراوانەی (کامەران)ە کە شاعیر تیایدا هۆگری سروشت بوە "ئەم هۆگربوونی سروشتە وە تا ئەم ڕادەیە دووری دەخاتەوە لە ژیان، لەو ڕووداوەی تیا ئەژی، ئەبێتە کۆسپ لە دەربڕینی ئەو بیروباوەڕەیدا، وەیا پاڵی پێوە دەنێ بۆ گۆشەگیری لەو بیروباوەڕەی"[٢٢] بۆ بەڵگەی بۆچونەکەشی تەنها چەند دێڕێکی کەمی لە هۆنراوەکە بە نمونە هێناوەتەوەو دەپرسێ "بۆ بفڕین بۆ سەرکانی و ناو چەم و درەختەکان؟ ئەی بۆ وێنەیەکی ڕوداوی ئەوتۆ نەخەینە پێشچاو کە لە زوربەی مناڵانی کوردەواری ڕوی دابێ، وەك بڵێین لە بیرتە یارە شیرینەکەم کاتێ منداڵ بووین لەناو گڵ و خۆڵی کۆڵانەکەماندا پێکەوە گەمەمان دەکرد.."[٢٣]. هەر دەربارەی ئەم پارچە هۆنراوەیە "کاکەی فەلاح"یش ڕای وایە کە "ئەم چەشنە خۆشەویستیە کە زۆرتر لە ژیریەوە نزیکەو کەمتر سۆزو هەستی پێوە دیارە، بابەتێکی نوێیەو شاعیر بە مەرج و ئاگا لەخۆبوونێکی وریاییەوە دەچێتە پێشەوە".[٢٤]

وەك دەبینرێ هەرسێ نوسەرەکە تەنها ڕویان لە چەند دێڕێکی هۆنراوەکە کردوە کە دیارە ئەمەش بە تەواوی ناتوانێ ڕوی ڕاستی تاقیکردنەوەکەی شاعیر دەربخات بۆیە بەلای ئێمەوە هۆنراوەی (یار) نە هەڵهاتنە لە واقع و نە بە تەنهاش گرنگی دانە بە هۆش بە شێوەیەکی وا کە هەست و سۆزی شاعیر وەك مرۆڤێك

شارابێتەوە. خوێندنەوەی هۆنراوەکە وەك بنیاتێکی یەکگرتوو لە لایەك و ئاگاداربونمان لە تێڕوانینی شاعیر خۆی کە بەلایەوە هۆنراوە "پێویستە ئەگەرچی هەر لە سروشت و دڵداریش بدوێت گیانێکی پاکی ئینسانی و نەتەوایەتی هەبێت وە ئەم دوو گیانەش لە بۆتەی دەرونیا یەك بخات"[٢٥] دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە شاعیر پێش مامەڵەکردنی لەگەڵ تاقیکردنەوەکەیدا ئەو دوو گیانەی لە دەرونیدا یەك خستوە بۆیە هۆنراوەکە لەگەڵ لە دایك بونیدا سیمای ئەو لایەنە مرۆڤایەتی و نەتەوایەتیەی بۆ شێوەو سۆزەکەشی لە ڕادەی تاقیکردنەوەکە خۆی دایەو ئەنجامی ڕاستگۆیی شاعیرەو بەشێکە لە تاقیکردنەوە مرۆڤ پەروەرییەکەی شاعیر و نەك هەر هەست و سۆزی تیا کەمترە بەڵکو سۆزێکی وای لێ دەتکێ کە لە ڕادەی ئەو ڕاستگۆییەی شاعیردایە. بەم پێیە بەلای ئێمەوەو لەم هۆنراوەیەدا تابلۆی سروشت بە درەخت و باخ و چەم و کانی نازدار و گوڵاڵەی شیرینیەوە بۆ خۆی هەڵگری گیانە نەتەوایەتیەکەی شاعیرەوە بابەتە دڵداریەکەش گیانە مرۆڤ پەروەریەکەی بەرجەستە کردوە.

یەکێ لەو تێبینیانەی کە لە لێکۆڵینەوەکەی (محمد صدیق عارف)دا سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە کە نوسەرەکەی هەوڵی داوە لە ڕوانگەی تێڕوانینێکی ڕەخنەگرانەی وردەوە ئاوڕ لە هۆنراوەکانی (کامەران) بداتەوەو زیرەکانە بە پێی بنەمایەکی ڕەخنەیی کامڵ بەرەو شیکردنەوەی هۆنراوەکان بچێ چونکە بە لایەوە "بیری هەر باسێك لە تاقی کردنەوەیەك پەیدا دەبێ کە ئەو شاعیرە پیا تێدەپەڕی وەیا یەکێکی تری دیبێ و بەڵام کارێکی کاریگەری کردبێتە سەردڵ و هەستی، ئەو بیرەش دەبێ بخرێتە بەرگێکەوە (مەبەستم شێوەی نوسینە) لەگەڵیدا بگونجێ وپڕ بە پێستی خۆی بێ، چونکە بیرو شێوە (الفکرة و الاسلوب) یەك یەکتر تەواو دەکەن"[٢٦]. بەڵام لەگەڵ ئەم تێڕوانینە ڕەخنەییە چاکەشدا کە دێتە سەر هۆنراوەکان هەندێ بۆچونی وای لا دروست دەبێ کە ئاکامی تەنها گرنگیدانە بە چەند دێڕێك نەك سەرتاپای هۆنراوەکە، هەروەك لەو بۆچونەیدا بەدی دەکەین کە دەربارەی ناوەڕۆکی هۆنراوەی (ئەی کچە شوان)ەو دەڵێ: "کە چاوم بەسەر نوسراوی ئەم هۆنراوەیە کەوت وا هات بە بیرما کە باسی کیژۆڵەیەکی بەرگ شڕی سەروپا پەتی جوانکەلە دەخوێنمەوە کە شوڵکێکی گرتبێ بە دەستەوەو لە نزیك ئاواییەوە بە دیار چەن سەر مەڕو بزنەوە دۆش دامابێ، هیواو ئاواتە ساکارە تێکەڵ بە کەساسی و هەناسە ساردیەکانی ختوکەی هەست و دڵی بدەن، کەچی کە خوێندمەوە نە کەمەو نە هیچی تری لەم بابەتەم نەدی بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا جەوهەری باسەکە ڕوداوەو لە ناوجەرگەی ژیانی کۆمەڵایەتیمانەوە هاتۆتە دەرێ، کەچی خۆم لە ئاسمانێکی ڕۆمانسیا دی گوێ بگرن دەڵێ:

بە ئاوازی شمشاڵەکەت
بە لەرەی لێوە ئاڵەکەت
هەستی خۆشم بێنە فڕین
بۆ ناو گوڵزار
چەم و نزار
ئاسمانی شین.."[٢٧]

لێرەداو ئەگەر هۆنراوەی (ئەی کچە شوان) وەك بنیاتێکی یەکگرتوو مامەڵە بکرێ و سەرنج لە دێڕەکانی دوای ئەو دێڕانە بدەین کە (محمد صدیق عارف) بە نمونەی بۆچونەکەی هێناویەتیەوەو بەلایەوە کەشێکی ڕۆمانسی دروست دەکەن، ئەوا ئەو تێڕوانینەمان لا دروست نابێ کە لای ئەو دروست بوە چونکە دوا کۆپلەی هۆنراوەکە بۆ خۆی ئەو ڕۆمانسیەتە ناگەیەنێ کە نوسەر بۆی چوە، ئەوەتا (کامەران) لە دوا کۆپلەدا دەڵێ:"[٢٨]

فرمێسکی ئاڵت بسڕەوە
کاتی (تێکۆشانە)و زەردە
ئاوی شەونم بخۆرەوە
هیوا هەرگیز
ئارامی کۆڕپەی ژیانە

هەر ئەم هۆنراوەیەی (کامەران) بۆتە هۆی ئەوەی کە (محمد صدیق عارف) بخاتە سەر ئەو ڕایەی کە "کامەران نزیکترین شاعیرمانە لە هۆنراوەی نوێوە، هۆنراوەی نوێ بە مانای هۆنراوەی سەربەست (حر) وە یا بەرەڵڵا (منطلق)"[٢٩] ئەم بۆچونەش بۆ خۆی پێویستی بە لێدوان هەیە چونکە بەلای (محمد صدیق عارف)ەوە "ناتوانرێ قۆناغی کامەران ناوبنرێ نوێ لەبەرئەوەی شیعری کوردی خۆی لە کۆت و زنجیری وەزن ڕزگار نەکردوەو هەر لەسەر وەزنی یەك پارچەیی دەڕواو کامەران لە چەند پارچەکیدا ئەو کۆت و زنجیرەی شکاندوە"[٣٠] بێگومان ئەم بۆچونە پێش هەموو شتێ ئەوە دیاریدەکات کە (محمد صدیق عارف) لەو کاتەدا هێڵێك لە هێڵەکانی نوێخوازی لە هۆنراوەی کوردیدا دیاری دەکات کە پەیوەندی بە ئاوازی هۆنراوەوە هەیە، هەر ئەم تێڕوانینەش بۆ خۆی بوە بنەمایەکی دیاری بزوتنەوەی (ڕوانگە) لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠دا کە خۆی یەکێك بوە لە ڕابەرانی، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە کە باس بێتە سەر هۆنراوەی سەربەست و ئەو هەوڵانەی کە لەم بوارەدا دراون، نابێ ئەوەمان لەیاد بچێ کە گەلێ پێش کامەران نوسەرانی وەك (جمال عیرفان) و (پیرەمێرد)مان هەریەکەو بە چەمکێك باس لە هۆنراوەی سەربەست دەکەن و شاعیرانی وەك (بەختیار زێوەر)و (گۆران) و (قەدری جان)یشمان چەند تاقیکردنەوەیەکی سەرکەوتویان لەم ڕوەوە هەبوەو دەکرێ بە سەرەتایەکی چاکی هۆنراوەی سەربەستی کوردی دابنرێن،[٣١] ئەمە جگە لەوەی کە (کامەران) خۆی لە یەك دوو هۆنراوەی ساڵی (١٩٥٤)یدا هەمان ئاواز بەکاردێنێ، سەرەڕای هەموو ئەمانەش دەبێ ئەوەش بوترێت کە هۆنراوەی

سەربەست لە ئەدەبی کوردیماندا هەروەك هۆنراوەی سەربەستی عەرەبی خۆی دور ناخاتەوە لە کێش و قافیە بەڵکو مامەڵە کردنێکی نوێیە لەگەڵ هەردوو بنەما گرنگەکەی ئازادی دەرەوەی هۆنراوەدا کە کێش و قافیەن، (محمد صدیق عارف)یش وریایانە ئەمەی ڕوون کردۆتەوەو دەڵێ: "زوربەی زۆر لەوانەی دورەپەرێز وەستاون لە هۆنراوەی نوێ وا دەزانن مەبەست لە خۆر ڕزگارکردن لە کۆت و زنجیری وەزن و قافیە، وازلێهێنانیانە بە تەواوی..! بێگومان ئەمانە بە هەڵەچوون چونکە لە بارەی وەزنەوە هۆنراوەی نوێش هەر لەسەر ئەو (بەحر)انە دەوترێ کە هۆنراوەی کۆنی لەسەر دادەڕێژرێ بەلام تەنها هێندە هەیە شاعیری نوێ بە ئارەزوی خۆی یاری بەو (بەحر)انە دەکاو هەڵیان دەسوڕێنێ، وەك لە هۆنراوەی (کچە شوان)دا کە پارچەیەکە لە هۆنراوەی ڕزگارکراو لە کۆت و زنجیری وەزن و قافیە لەسەر بەحری (هەزەج) دانراوە"،[٣٢] بەلام دیارە کە کێشی ئەم هۆنراوەیە پەیوەندی بە (هەزەج) و (بەحر)ە عەرەبیەکانی عەروزەوە نییە، بەڵکو کێشەکەی (هەشت برگەیی)یەو تیایدا دەستەپێی جیاوازی ئەو کێشە بەکارهێنراوە کە بریتین لە دەستەپێی (٤ + ٤) و (٥ + ٣) و (٦ +٢) و (٣+ ٥).

هەر ئەو تێڕوانینەی (محمد صدیق عارف) کە بۆ ئەوکاتە تێڕوانینێکی زیرەکانەیەو پێشبینیەکی سەرنجڕاکێشە لە بواری لێکۆڵینەوەی هۆنراوەی کوردیماندا، لە لێکۆڵینەوەکەی (ناکام)دا پشتگیری لێ ناکرێ چونکە بەلای (ناکام)ەوە وەك خۆی دەڵێ: "من کامەران دەناسم ئەگەر نەشم ناسیایە تەنها بە هۆی سەرنجی هەڵبەستەکانیەوە دەتوانم بڵێم هەر لەبەرئەوەی دانەری خۆی دەڵێ شارەزای بەکارهێنانی کوردی پەتییەو سەرنجی وردی هەیە لە دەربڕینی ماناداو شیعرەکانی گەرم و دڵگیرو هەستاوین و پاشەڕۆژێکی گەش و ڕوناکی لێ چاوەڕوان دەکرێ، نابێ شاعیرێکی بەرەڵڵا بێ، هیواشی لێ ناکرێ لە دواڕۆژدا ببێتە شاعیرێکی بەرەڵڵا، چونکە شاعیرێك توانای هەڵبەستی ڕێك و ئاوازەداری ببێ هۆی ناکەوێتە شیعری بەرەڵڵا"[٣٣]. بێگومان ئێمە لێرەدا کەم و زۆر لەگەڵ ئەم بۆچونەی (ناکام)دا نین، دیارە (محمد صدیق عارف)یش ئاگاداری ئەوە بوە کە ئەو ئاوازەی لە (ئەی کچە شوان)دایەو بە لایەوە هەنگاونانی شاعیرە بەرەو داهێنان ڕەنگە لە لایەن نوسەرانی ترەوە پەسەند نەکرێ بۆیە دەڵێ: "ئەوەتا کامەران چەند پارچەیەکی لەم بابەتە بۆ وتوین و تا ڕادەیەکی بەرزیش تیایدا سەرکەوتوە، تەنها ماوەتەوە سەر ئەوەی کامەران ئازاو چالاك بێ‌و لە قسەی ئەم و ئەو نەترسێ"[٣٤] بەلام دیارە قسەی ئەم و ئەو لە لایەك و شێواندنی ئەم تاقیکردنەوە نوێیە لە لایەکی ترەوە بوە هۆی ئەوەی کە (کامەران) لە هۆنراوەی سەربەست دورکەوێتەوە، چونکە خۆی باس لەمە دەکات و دەڵێ: "بەلای منەوە هۆنراوەی سەربەست مۆسیقاکەی زۆر بەسۆزترە لە هۆنراوەی ترو بەریشی فراوانترە بۆ دەربڕینی هەست، بەلام داخەکەم نە شارەزایان کە دەستیان دایە ئەم هۆنراوەیە بە جۆرێکی ئەوتۆ شێواندیان کە خوێندەواران بە تەواوی لێی وەڕس و هەراسان بن، وەك مەسەلەیەکی کوردی دەڵێت (بە ڕاستی سفاتیان ڕەزیل کرد)، لەبەرئەوە بوو کە من وتم لەگەڵ هۆنراوەی سەربەستدا نیم و گەڕامەوە سەر هۆنراوەی کێشدا"[٣٥] دەربارەی ئەم بۆچوونەی کامەران دەبێ دوبارە ئەوە بێنینەوە یاد کە لە هۆنراوەی سەربەستدا هیچ کاتێ ناتوانرێ دەست بەرداری کێش ببین وەك کامەران هێمای بۆ دەکات، هەروەها هەر ئەم بۆچونەی کامەران ئەوە دەردەخات کە هۆیەکی تری وازهێنانەکەی ئەو تێڕوانینەی بوە دەربارەی هۆنراوەی سەربەست جا زانیبێتی یا نەیزانیبێ کە لە ڕاستیدا زوربەی شاعیرانمان ئاگاداری چەمکی هۆنراوەی سەربەستی کوردی نین و بنەماو بنەڕەتە تایبەتیەکانی نازانن، هەر بۆیە هەنگاونانی هۆنراوەی کوردی لەم بوارەدا گەلێ سستەو لە ڕادەی خواستەکانماندا نییە.

سەرنجێك لە سەرنجەکانی تری (محمد صدیق عارف) ئەوەیە کە لایەوە: "هۆنراوەکانی کامەران بە تایبەتی ئەو هۆنراوانەی کە لە سروشت و هەستی تایبەتی خۆی دەدوێن، یەکێتی مانایان بە هیچ جۆرێك تیا نابینرێ"،[٣٦] چەمکی یەکێتی ماناش بەو جۆرە دیاریدەکات کە "باس هەیە مل دەدا بۆ یەکێتی ماناو باس هەیە نەء"،[٣٧] لە ڕاستیدا چۆنیەتی و چەندێتی بابەت کەم و پەیوەندی بە چەمکی یەکێتی هۆنراوەوە نییە چونکە گەلێ جار شاعیر باس لە یەك بابەت دەکات کەچی هۆنراوەکەی بنیاتێکی یەکگرتوو ناگرێتە خۆی، هەروەك چۆن ئاساییە کە تاقیکردنەوەکەی بە گەلێ بابەت بەرجەستە بکات و بنیاتێکی ئاوێتە یاخود یەکگرتویان لێ پێك بهێنێ، هەر لەم ڕوانگەیەشەوە دەتوانرێ لە بنیاتی هۆنراوەی کوردیدا چوار چەشنە بنیات دیاری بکرێت و ئێمە لەلای خۆمانەوە بە بنیاتی سادەو تێکەڵ و لێکدراو و ئاوێتە ناومان بردوە[٣٨].

بەو جۆرە (کامەران)ی شاعیر بە یەکەم هەنگاوی لە جیهانی هۆنراوەی کوردیدا بە تەواوی شوێن پێی خۆی کردەوەو بوە یەکێ لە شاعیرە دیارەکانی ئەو قۆناغە، هەر ئەم زەمینە پتەوەی تاقیکردنەوەی هۆنراوەیی لەلای بوە هۆی ئەوەی کە هەنگاوی تری لە دواوە بێت و بەرەو تاقیکردنەوەی نوێ تری بەرێت.

**هەنگاوی دووەمی کامەران لە بواری داهێناندا:**

دوابەدوای دیوانی (دیاری) و کۆمەڵێ هۆنراوەی تری هەمان تاقیکردنەوەو شێواز، (کامەران) ڕووەو تاقیکردنەوەیەکەی تر هەنگاوی نا کە بریتی بوو لە گرنگیدان بەو چەشنە هۆنراوانەی کە کورتن و بە گشتی ژمارەی دێڕەکانی لە شەش دێڕ (سێ بەیت) تێپەڕ ناکات. لەم ڕووەوە (کاکەی فەلاح) بە وردی ئەوەی دیاری کردوە کە: "ئەم هەنگاونانەی کامەران بە پێچەوانەی ئەو بۆچونەی بوە کە لە پێشەکی دیوانی دیاریەکەیدا سەرنجی خوێنەرانی بۆ ڕاکێشابوو چونکە لەوێدا بە ڕای کامەران هۆنراوەی تازە دەبێت لەسەر ئسلوبی کوردی ڕێکبخرێت -لە چوارین و پێنجین دورکەوێتەوە.. بەڵام لە دواییدا کامەران خۆی سیمای تازەکردنەوەی هۆنراوەکانی لەم پارچە بچوکانەدا بەدیکردوە، تازەکردنەوەش لەوەدا بوە کە لە پێش ئەمدا ئەم چوارینانە کە وتراوە بیرەکەی پەند بوە بەڵام هی ئەو بە شێوەیەکی گشتی باری سیاسی گرت و ببوو بە بروسکەیەك بۆ تێکۆشان"،[39] ئەم بۆچونەی (کاکەی فەلاح) بۆ خۆی تێڕوانینێکی ڕەخنەیی زیرەکانەیە بە تایبەتی لەو ڕووەوە کە دەریخستوە (کامەران) خۆی سیمای تازەکردنەوەی هۆنراوەکانی لەو پارچە بچوکانەدا بەدیکردوە، چونکە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە (کامەران) بە هۆشمەندییەوە مامەڵەی لەگەڵ تاقیکردنەوەکانیدا کردوەو بەرەو داهێنان هەنگاوی ناوە، بێگومان ئەمەش بۆ خۆی پێویستی بەوە دەبێت کە ڕادەی سەرکەوتنی لەم هەنگاونانەیدا دیاری بکرێ.

دەربارەی ئەو هۆنراوە کورتانەی (کامەران)، (د. کامل حسن البصیر) بۆ ئەوە چوە کە کامەران: "بەم ڕێگایە لەناو شاعیرە هاوچەرخەکانی ئەمڕۆی کوردا تاك و تەنیایە، ئەم دیاردەیە لە خۆیەوە نەهاتوە بەڵکو سروشتی بابەتە شیعریەکان دروستی کردون، چونکە شاعیر بابەتی سیاسی لە دەوری پاشایەتیدا وەرگرتوەو کەس نەیتوانیوە بە ئاشکرا دەم لە سیاسەتەوە بدات، جا ئایا لە داروبارێکی وادا شاعیر دەتوانێت قەسیدەی درێژی لەو بابەتە بڵێت؟ کێ بۆی بڵاودەکاتەوە، چۆن دەچێتە ناو خەڵکەوە؟ کەواتە وەك دەڵێن پێویستی دایکی داهێنانە، بۆیە شاعیر پەنای بردۆتە بەر ئەو شێوەی چوارین و پێنجین و بەیتانەوە"[40].

(کاکەی فەلاح)یش دەربارەی ئەو بۆچونەی (کامل حسن



البصیر) لە لایەك و بۆچونی خۆشی لە لایەکی ترەوە دەڵێ: "ئەم ڕایە ئەگەرچی لە ڕاستی بێبەش نیە بەڵام هۆی تریش هەیەو زۆرە نەهاتۆتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە کە ئەم بابەتە کە لە بابە تایەری هەمەدانیەوە هەیەو کەم و زۆر شاعیرانی کورد چەرخاوچەرخ پشتاوپشت وەك ڕێگایەکی لاسایی کردنەوە بەرهەم و تاقیکردنەوەیان هەیەو گەرمیان و کوێستانیان پێکردوە، ئەم بابەتە چوارینانە زۆرتر بیری ڕاگوزاری و چەخماخەی بیرو هەست و کەم ئەرکی شیعر و خۆماندو نەکردن و زوو بە دەستەوەدان دروستیان دەکات"[11] پێش هەموو شتێ دەبێ ئەو ڕاستییە بخەینە ڕوو کە ناونانی سەرجەمی ئەو هۆنراوە کورتانەی کامەران بە چوارین و پێنجین ڕاست نییە، چونکە ئەگەر چاوێك بە چاپی دوەمی (گوڵاڵە سورە)کەیدا بگێڕین کە زوربەی هەرە زۆری ئەو هۆنراوە کورتانەی کامەرانیان تیادا کۆکراوەتەوە دەبینین لە (٧) پارچەی (دوو) دێڕی و (٤٠) پارچەی (چوار) دێڕی و (٢) پارچە (پێنج) دێڕی و (٤١) پارچەی (شەش) دێڕی و لە تەنها پارچەیەکی (دە) دێڕی پێکهاتوە، کەواتە ژمارەی ئەو پارچانەی کە لە (شەش) دێڕ پێکهاتون لە (چوار) دێڕییەکەش زیاترە بۆیە ناکرێ بە چوارین و نە بە پێنجین ناویان بەرین. هەرچی دەربارەی سەرهەڵدانی ئەم چەشنە هۆنراوانەشە لای کامەران، ئەوا بەلای ئێمەوە هیچ کاتێ ئەنجامی کەم دەرفەتی بڵاوکردنەوە نەبوە چونکە نەك هەر دیوانە چاپکراوەکانی تری ئەو سەردەمەو هەموو ئەو هۆنراوە درێژانەی کە لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بڵاوکراونەتەوە بەڵکو دیوانی (دیاری)یەکەی کامەران خۆی کە تەنها شەش پارچە هۆنراوەی کورتی تێدایە ئەوە دەسەلمێنن کە کەم دەرفەتی بڵاوکردنەوە لەو سەردەمەدا پەیوەندی بە ڕوکردنە ئەم تاقیکردنەوەیەو برەوپێدانی ئەم چەشنە هۆنراوە نەبوە لای کامەران. هەر دەربارەی ئەم باسە دەبێ ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە تاقیکردنەوەی شاعیران لە ئەدەبی کوردیدا بێ یاخود لە ئەدەبی میلەتانی تردا بێت لە لایەك و تێڕوانینە ڕەخنەییە جۆربەجۆرەکانی جیهانیش لە لایەکی ترەوە کەم و زۆر ئەوەیان نەگەیاندوە کە لەدایکبونی ئەم پارچە کورتانە لەچاو هۆنراوەی درێژدا ئەوەندە ئاسان بێت کە خۆماندونەکردن و زوو بە دەستەوەدان بگەیێنن، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ناوبانگی ئەو شاعیرانەی کە بەم چەشنە بنیاتەی هۆنراوەوە ناسراون لە ناوبانگی ئەو شاعیرانە کەمتر نیە کە بە هۆنراوەی درێژ ناسراون، ئەمە جگە لەوەی کە هیچ کاتێ کورتی و درێژی هۆنراوە لەو ڕوانگەیەوە تێی ناڕوانرێ چونکە جاری وا هەیە تەنها بەیتێك دەتوانێ تاقیکردنەوەیەکی وا بەربڵاو دەربڕێ کە لە پارچە هۆنراوەیەکی درێژدا بەدی نەکرێ. هەر لێرەوە کە ئاوڕ لەو هۆنراوە کورتانەی کامەران دەدرێتەوە دەبێ لە ڕوانگەی ئەو چەمکەوە لەگەڵدا بکەین کە ڕەگەزەکانی لە دایك بونیان ڕەگەزی جیاجیاو لە یەك دابڕاو نین و تاقیکردنەوەکانی شاعیر خۆی بابەت و سۆزو ئەندیشەو وێنەو ئاوازی هۆنراوەیی لە بنیاتێکی هونەری گونجاودا پێکدەهێنێ جا بۆیە سۆزو ئەندێشەو وێنە هونەریەکانیش بۆ خۆیان لە ڕادەی ئەو بابەتانەدان کە تاقیکردنەوەکانی پێ بەرجەستە دەکرێ و لاوازی یەکێکیان سیمای تاقیکردنەوەکە دەشێوێنێ بەم پێیە بەلای ئێمەوە هەوێنی

سەرهەڵدان و برەوپێدانی ئەم پارچە کورتانە لای کامەران گرێدانی دوو بەهرەی کامەران خۆی بوو پێکەوە کە بریتی بوون لە بەهرەی دواندەری و دەنگە دلێرەکەی و بەهرەی شاعیرێتی و توانای پێك هێنانی وێنەی هونەری گونجاو بۆ ئەو سۆزە هەڵچووەی کە بابەتە شۆڕشگێڕێتیەکەی خەملاندوەو ئاوازی هۆنراوەکەی سازداوەو لە بنیاتێکی کاریگەردا دایڕشتوە:[٤٢]

زۆرجار ژیانم تاریک دائەهات

ئاگر بەرئەبوو لە باخی ئاوات

پێم لەناو خوێنا، زنجیری ئاسن

پیائەڕشت تەزووی بەتینی مردن

سام هەر نەیتوانی پێ بەرێ بنێ

بە کێوی ورەی دڵما هەڵزنێ

دوا هەنگاوی کامەران و بێدەنگییەکەی:

لە سەرەتای ساڵی (١٩٧٠)داو دوابەدوای بڵاوبونەوەی بانگەوازی (ڕوانگە) و دەنگی نوێخوازی لە ئەدەبی کوردیدا بە گشتی و لە هۆنراوەی کوردیدا بە تایبەتی، ڕاستەوخۆ ڕوو لە کامەران کراو ئەو پرسیارەی لێکرا کە: "دەوترێت کامەران لە پلەیەکی نزیکی ئەدەبی سەردەمی تازەماندا لە هەرە شاعیرە تازەکەرەوەکانمان بوو کەچی بەبێ گۆڕینێکی ئەوتۆ ئێستاش هەر لەسەر ئەو ڕێبازو شێوەو ناوەرۆکەی ئەو وەختە دەڕوات"[٤٣]، ئەم پرسیارەو ئەو تێڕوانینە دەربارەی کامەران لە دوای بڵاوبونەوەی دوا دیوانی کە (زەبری هۆنراوە)ی ساڵی (١٩٧١)ە نەك هەروەك خۆی مایەوە بەڵکو ڕوخسارێکی توندتریشی گرتە خۆی و هێمای وشك بونەوەی بۆ کرا[٤٤]. هەرچی کامەران خۆشی بوو ئەوە لە پرسیارەکە نەدەگەیشت و دەیپرسی: "ئاخۆ مەبەست لە گۆڕین و تازەکردنەوە چیە؟"[٤٥]. لە ڕاستیدا (کامەران) ناهەقی نەبوە کە لەو پرسیارە نەگەیشتوە چونکە نەك هەر ئەوکاتە ئێستاش بە تەواوی کە باس لە نوێخوازی و تازەکردنەوە دەکرێ بە تەواوی چەمکەکەی دیاری ناکرێ و بنەماو بنەڕەتییەکانی دیاری ناکرێ.

هەرچۆنێ بێ ئەو پرسیارەو ئەو تێڕوانینەش بۆ خۆی دیاردەیەکی زۆر ئاسایی بوە، ئەگەرچی هەندێ جارو هەندێ نوسەر وای نەدەبینی[٤٦]، چونکە ئەگەر بەو شێوەیە لە کامەران و شاعیرانی قۆناغەکەی نەڕوانرایە ئەوا ئەو بزوتنەوە تازەگەرییەی کە مەبەست بوو هیچ مانایەکی نەدەبەخشی بەوپێیەی ئەگەر لەو کاتەدا هەنگاوی نوێتر لای (کامەران) بەدی بکرایە ئەوا بزوتنەوەی نوێخوازیەکە بۆی نەدەکرا باس لە ڕێچکە شکاندن بکات، خۆ نەشدەکرا لە تێڕوانینەکەیاندا مەبەستیان ئەوە بوو بێت کە هەنگاوەکەی ئەمان هەنگاوێ پێش ئەوەش کەوتوە کە لە کامەرانیان داوا دەکرد.

لێرەدا بەلای ئێمەوە، ئەوەی کە لە کامەران داوا دەکرا زۆر بە ئاشکراو ڕونی لە (زەبری هۆنراوە)کەیدا بەدی دەکرێ و ئەم دیوانەی کامەران نەك هەر هێمای وەستان و بەرەو دوابونەوەی ناکات بەڵکو زوربەی هۆنراوەکانی ناو ئەم دیوانە بونەتە بنکەی ئەو تەقینەوە نوێیەی کە داوای لێدەکرا، لێرەدا دەبێ ئاگاداری ئەوەش بین کە باسکردن لە وشکبونەوەی کامەران وەك پێشبینیەك بۆ دەنگییەکەی دوایی وەرناگیرێ چونکەی بێدەنگیەکەی دوایی –هەروەك ڕونی دەکەینەوە لە ئەنجامی بێدەسەڵاتی و کزبونی سەرچاوەی تاقیکردنەوەکانیەوە نەبوە.

بۆ بەڵگەی بەدیکردنی داواکاری بزوتنەوەی نوێخوازیەکە لە هۆنراوەکانی (زەبری هۆنراوە)کەیدا سەرەتا ئاوڕ لە تێڕوانینی کۆمەڵەی (ڕوانگە) دەدەینەوە بەوپێیەی ئەو تێڕوانینە بوە بنەمای ئەو بیرە نوێخوازیەی کە لەو سەردەمەدا لە ئارادا بوە. کۆمەڵەی (ڕوانگەی) وەك خۆیان دەیانوت: "ئێمە گۆشکراو و تاڵبوی ئەو بەسەرهاتانەین *[واتە ساڵانی پێش بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکە]* بۆیە ئێستا هەرچی بنوسین دورو نزیك بە چاك و خراپی بە ستایش کردن و بێزاری دەربڕین بەرهەمی خۆخواردنەوەیەکی قوڵمانە لە ئاستیاندا، واتە ئێمە دڵسۆزترین زبان و دەنگی ئەم سەردەمەی خۆمانین نەوەی پێش ئێمەش (کە هێشتا لە ژیاندان) لەو سنورەدا دەبزوێن بەڵام ئێمە لە بۆتەی ئەدەبیاتدا ئەو کارەسات و بەسەرهاتانە بە هەزارو یەك باردا دەمرێنن و دەژێنینەوە، لە کاتێکدا نەوەی پێش ئێمە ناتوانن لە سنوری ڕستێك دروشمی پیرۆزی ڕابردوو بچن بەودیواد[٤٧]. جا ئەگەر لێرەوە ئاوڕ لە (زەبری هۆنراوە)کەی بدەینەوە، بە ئاشکرا هەست بەوە دەکەین کە ئەمیش لە ڕوانگەیەکی گەلێ نوێوە دەڕوانێتە ئەو بەسەرهات و کارەساتانەی کە خۆی لە ناویدا دەژیاو بە هەزارو یەك بارداو بە تێڕوانینێکی تازەترەوە دەیانمرێنێ و دەیانژێنێتەوە، هەر بۆیە دەڵێ[٤٨]:

وا شیعرم داگیرسانەوە

ئاسنی سامم توانەوە

دوا قەڵای وەنەوزم ڕوخان

خوێنی ئۆقرەو ماتیم ڕژان

هاتوومەوە بەرەو مەڵبەن

بەرەو شاری دەروون بۆگەن

* * *

ئەبێ هەزاران پێشێل کەم

تا ئەگەمەوە دڵەکەم

ئەو دڵەی وەک دڵان نییە

ترسنۆک و نیان نییە

* * *

دڵە گەشەکەی جارانە

دڵی پاکی تێکۆشانە

بەم جۆرە ئاوڕدانەوەمان لەگەڵ پارچەی ناو (زەبری هۆنراوە)کەی و مامەڵە کردنمان لەگەڵیاندا وەك پارچەیەکی یەکگرتوو نەك تەنها هەڵبژاردنی یەك دوو دێڕ لێرەو لەوێ، ڕاستەوخۆ دەمانگەیێننە ئەو ڕاستیەی کە ئەم هەنگاوەی کامەران بۆ خۆی هەنگاوێکی نوێ بوەو کەم و زۆر سیمای پاشگەزبونەوەی تیادا بەدی ناکرێ، تەنانەت هۆنراوەی (بۆ ئاگاداری)یەکەشی بەلای ئێمەوە بەڵگەی بەرەوپێش چون و تەقینەوەیەکی نوێی تاقیکردنەوەکانی بوە نەك بەرەو دوا بونەوەی، چونکە کە دەڵێ[٤٩]:



بەڵێن بێ ئەی كچ، بەڵێن بێ ئەی گوڵ

ئەی دەشت و دەرو چیای كوردستان

من جارێكی تر نە بەدەم نە دڵ

بۆ ئێوە نەڵێم هۆنراوەی جوان جوان

تەنها هۆنراوە ئەڵێم بۆ هەژار

هەر لەگەڵ ئێوەم ئەی هەژارینە

تەنها هۆنراوە ئەڵێم بۆ هەژار

هەژار هەوێنی شیعری خوێنینە

لێرەدا (كوردستان) نەبۆتە نیشانەی خاك بەڵكو وەك جوانی سروشت باس دەكرێ و لە كۆپلەی یەكەمی هۆنراوەكەشدا بە ڕونی ئەمەمان بۆ دەردەكەوێ كاتێ دەڵێ:

هۆنراوەكانم هەر بۆ ئافرەت بوون

بۆ خونچەی گوڵ و بۆ جوانی سروشت

خوێنیان ئەمژی لە بەهرەی دەروون

ڕستی زێڕین و جوانیان دائەڕشت

ئەمە جگە لەوەی هەمومان دەزانین كە هۆنراوەكانی پێشوی هەر بۆ ئافرەت و گوڵ و جوانی سروشت نەبوەو زۆربەیان هەر بۆ ئەو هەژارانە بوە كە لێرەدا دەیەوێ ڕویان تێبكات، دیارە ئەم شێوە تێڕوانینەی بەو مەبەستە بوە كە لە هۆنراوەكانی پێشوی ڕازی نەبوە، ئەمەش بۆ خۆی ئەوە دەگەیەنێت كە دەیەوێ بە دڵسۆزیەوە تەعبیر لەو بارە ئاڵۆزانە بكات كە تاقیكردنەوەكانی ژیانی ڕوبەڕوی دەكردنەوەو لە سنوری بیر گواستنەوە بچێتە دەرەوەو داهێنەرانە مامەڵە لەگەڵ تاقیكردنەوە نوێیەكانیدا بكات، بۆیە لێرەدا دەتوانین بڵێین كە مەبەستی لە هەنگاوێكی نوێ بوە نەك پاشگەز بونەوە.

لە باسێكدا كە دەربارەی (كامەران) و هۆنراوەكانی بێت ئەوا باسی بێدەنگیەكەی دوای دیوانی (زەبری هۆنراوە) ڕاستەوخۆ دێتە ناوەوەو دەبێ ئاوڕی لێبدرێتەوەو پەردە لەسەر ئەو ڕاستیە هەڵبدرێتەوە كە بێدەنگیەكەی ئاكامی وشك بونەوەی سەرچاوەی هۆنراوەكانی نەبوە، چونكە هۆنراوەكانی بە گشتی و (زەبری هۆنراوە)ەكەی بە تایبەتی بۆ خۆیان سیمای دینامیكیەتی هۆنراوەی شۆڕشگێڕێتیان تیادا دەبینرێ، ئەو سیمایەی كە شۆڕشگێڕێتی بە لایەوە كارێكی بەردەوام و هەمیشە نوێیەو هیچ كاتێ ئەو بەرگەی نەپۆشیوە كە وەك كارێكی میسالی دەركی پێ بكات. (كامەران) خۆی لە هەموو كەس باشتر ئەوە دەزانێ كە تەنها دیاریەك بۆ مرۆڤی خەباتكەر هەر ئەو چەپكە گوڵەیە كە یا دەدرێتە دەستی یاخود دەخرێتە سەر مەزاری بۆیە بەلایەوە گرنگ نەبوە كە تەنانەت چەپكە گوڵەكەشی بدرێتە دەست بەڵام كە كار بگاتە ئەوەی هەندێ هەڵوێست ئەوە بگەیەنێ و هێمای ئەوە بكات كە پێی بوترێت تۆ كێیت و تۆ چیت؟ ئەمەیان وەك مرۆڤ زامێك دەكاتە دڵەوە كە تا ئێوارە بڵێ[٥٠]:

لە چیاكان لە لووتكەی بەرزو نودا

لە ئاگری بە نێڵە نێڵی بڕوا

لە كۆتی پێ كەلەپچەی دەست بپرسن

من چیم و كێم ئەوان چاكم ئەناسن

زامی وا ساڕێژ نابێت و نەئەبوایە هێمای پرسیارێكی وا بخرایەتە بەردەم (كامەران) تا ئەویش تازە بە تازە خۆیمان پێبناسێنێ، هەر ئەمەش بوو وەك مرۆڤێك دڵی گەردبگرێ و بگاتە ئەو قەناعەتەی كە بەو هەموو تێكۆشان و قوربانیدان و بەرهەمانەی كە لاوانی پێ گۆش دەكرا نەزانرێ تازە بگەڕێتەوەو تەنها بە بەرهەمی هۆنراوەیی خۆیمان پێ بناسێنێ؟ تاقیكردنەوەی هۆنراوەیی (كامەران) لە ڕادەیەكدا بوو كە هیچ نەبێ بتوانێ وەك كارسازێكیش بێت مامەڵە لەگەڵ هۆنراوەدا بكات و بەرهەمی هۆنراوەیی بخاتە بەردەست خوێنەر، جا هیچ كاتێ پێی ناخۆش نەبوە داوای هۆنراوەی لێ بكرێ چونكە وەك خۆی دەیوت: "ئەگەر كامەران نەبوومایە كەس داوای هۆنراوەی لێ نەدەكردم"[٥١]، بەڵام ئەگەر داواكردنەكە تەنها لە ڕوانگەی ئەو بۆچونەوە بووبێت كە گوایە وشك بۆتەوە تەنها وەك شاعیر تەماشا بكرێ و هێمای ئەوە بێت كە بێ هۆنراوە، (كامەران) نە تێكۆشەر و دڵسۆزەكەی جارانەو نە شاعیریشە، ئەمەیان دووبارە دڵڕەنجاندنی تیادا بوەو هەروەك ئەو پرسیارە بوە كە ناچاری كرد وەڵامی بداتەوە، وەك ئاگاداریشین گەلێ جار لەم تێڕوانینەی دواییەوە داوای هۆنراوەی لێ دەكرا بۆیە یەكێ لە هۆنراوەكانی دوایی بۆ خۆی وەڵام دانەوەیەكی ئەو داواكاریانە بوەو دەڵێ[٥٢]:

ئەگەرچی دڵی سەردەمی لاویم

بڵێسی بەرزی نیشتمانم بوو

بازووی بەهێزوو جەستەی خوێناویم

نیشانەی زەبری تێكۆشانم بوو

بەڵام پیریەكەم سوتێنەرترە

چونكە نەك هەر دڵ بوونم ئاگرە

**ئەنجام:**

كاتێ (كامەران) بە دیوانی (دیاری)یەكەی و چەند پارچە هۆنراوەیەكی پێشتریەوە هاتە ناو جیهانی هۆنراوەوە، هۆنراوەی كوردی ڕێڕەوێكی گشتی و سیمایەكی تایبەتی خۆی هەبوە، (كامەران) خۆشی ئاگاداری ئەوە بوە، هەروەك خۆی دەڵێ: "ئێمەش لە كاتێكدا دەستمان داوەتە هۆنراوە كە دەرگای ڕیالیزمیەت خرابوە سەرپشت"[٥٣]، هەربۆیە دیاریكردنی شەقڵ و سیمای داهێنان لە هۆنراوەكانیدا دەبێ لە چوارچێوەی ئەو

ڕێڕەوە گشتی و سیما تایبەتیەی هۆنراوەی کوردی ئەو قۆناغەوە ئەنجام بدرێ، کاتێکیش لەم ڕوناگەیەوە ئاوڕمان لە هۆنراوەکانی دایەوە بە ئاسانی ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە یەکەم هەنگاوی کامەران بە دیوانی (دیاری)یەکەی هەنگاوێکی وا پتەو بوو کە ڕاستەوخۆ لەسەر زەمینەی هۆنراوەی کوردی جێگای خۆی کردەوەو بوە هۆی ئەوەی کە هەنگاوی تری بەدوادا بێت و تاقیکردنەوەکەی ئاراستەی بنیاتێکی تری هۆنراوە بکات و بە هۆی ئەمیشەوە ئەوەندەی تر جێگاو شوێنی خۆی لە مەیدانی هۆنراوەی کوردی ئەو قۆناغەدا بکاتەوەو تا سەرەتای حەفتاکانیش هەر بە (شاعیری هەڵکەوتووی کورد)[٥٤] بناسرێ. هەرچی (زەبری هۆنراوە)کەشیەتی کە دوادیوانێتی ئەوا بەلای ئێمەوە بوە بنکەی هەنگاوێکی نوێی کامەران و ئەگەر بێدەنگیەکەی دوایی نەبوایە ئەوا تاقیکردنەوەیەکی تازەتری پێ ئەنجام دەدا چونکە ئەوەی لا ئاشکرا بوە: "ڕیالیزمی نوێ پێویستە هێز بدات بە دەماری ڕەنجبەران بۆ تێکۆشان و کۆڵنەدان نەك نائومێدی بڕژێنێتە دڵیانەوە" و "یاخی بوون دەبێ سودی ئەو چینە چەوساوانەی تێدابێت نەك یاخیبوون هەر بۆ یاخیبوون بێت"[٥٥].

**پەراوێزەکان:**

١–کۆڕێکی (نیسانی ساڵی ١٩٨٣)وە وەرگیراوە کە لە شاری هەولێر بۆ کامەران گیرابوو بە ناوی (من و هۆنراوە).

٢ –دیاری، کامەران، چاپخانەی مەعارف، بەغدا ١٩٥٧: ١٣.

٣ –کامەران و دیارییەکەی، مەعرفو بەرزنجی، گۆڤاری شەفەق ژمارە (١)ی ١٥ ك ٢، ٩٥٨: ٢٠.

٤–کامەران و هۆنراوەی نوێ (لێکۆڵینەوە)، محمد صدیق عارف، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٥٨: ٢١. (محمد صدیق عارف) کاك (حسین عارف)ی چیرۆك نوسە.

٥–الواقعیة في الادب الكردي. د. عزالدین مصطفى رسول، صیدا، ١٩٦٦: ١١١.

٦–دیاری: ٢٠.

٧–کچە شقارتە فرۆشەکە، هانس ئەندەرسون، گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (٤)ی ساڵی (٤): ٣١ کاتی خۆی (پەخشان صابر) کە قوتابی کۆلیجی ئاداب بوو سەرنجی بۆ ڕاکێشام.

٨–دیاری: ٢٣.

٩–دیوانی گۆران، ئامادەکردنی محمدی مەلا کەریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق، بەغدا، ١٩٨٠: ٥٧.

١٠–دیوانی گۆران: ٩.

١١–دیار: ٦٢.

١٢–سەرچاوەی پێشوو: ٦٦.

١٣–دیوانی گۆران: ٤٢.

١٤–کاروانی شیعری نوێی کوردی، کاکەی فەلاح، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨: ٢٣٦.

١٥–سەرچاوەی پێشوو: ٢٣٩.

١٦–سەرچاوەی پێشوو: ٢٤٥.

١٧ –بەختیار زێوەر (ژیان و بەرهەمی). دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات. ژمارە (٢٢)ی ساڵی ١٩٧٨: ٤٩.

١٨–دیوانی کامەران موکری. ئامادەکردنی عەبدوڵڵا عەزیز خالد، چاپخانەی ڕۆشنبیری و لاوان، هەولێر ١٩٨٨: ٢٦٧.

١٩–الواقعیة في الادب الكردي: ٢١٣.

٢٠–دیاری: ٣١.

٢١–کامەران و دیارییەکەی. گۆڤاری شەفەق ژمارە (یەك)ی ١٥ ك ٢ ١٩٥٨: ٢٠.

٢٢ –کامەران و هۆنراوەی نوێ: ٤٩.

٢٣ –سەرچاوەی پێشوو: ٤٩.

٢٤ –کاروانی شیعری نوێی کوردی: ٢٤٢.

٢٥–دیاری: ١٣.

٢٦ –کامەران و هۆنراوەی نوێ: ٤٥.

٢٧ –سەرچاوەی پێشوو: ٤٥.

٢٨–دیاری: ١٩.

٢٩ –کامەران و هۆنراوەی نوێ: ٤٣.

٣٠ –سەرچاوەی پێشوو: ٢٢.

٣١ –بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا، دڵشاد علی محمد، نامەی ماجستێر: ١٦٦–١٧٠.

٣٢ –کامەران و هۆنراوەی نوێ: ٥٤.

٣٣–هۆنراوەی نوێ، لێکۆڵینەوەیەکی وێژەیی، ناکام، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٥٩: ٣٤.

٣٤ –کامەران و هۆنراوەی نوێ: ٤٤.

٣٥–لەگەڵ کامەراندا، ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (١٦)ی شەممەی ٢/٥/١٩٧٠: ٤، ٧.

٣٦ –کامەران و هۆنراوەی نوێ: ٥٦.

٣٧ –سەرچاوەی پێشوو: ٥٧.

٣٨–بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا (نامەی ماجستێر): ٥٢–٨٨.

٣٩ –کاروانی شیعری نوێی کوردی: ٢٤٧.

٤٠ –لە کتێبی (کاروانی شیعری نوێی کوردی)یەوە: ٢٤٧.

٤١ –کاروانی شیعری نوێی کوردی: ٢٤٧–٢٤٨.

٤٢ –دیوانی کامەران موکری: ٢٧٢.

٤٣–لەگەڵ کامەراندا، ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (١٦): ٤.

٤٤ –زەبری هۆنراوەو کارەساتی وشك بوونەوە، سامی شۆڕش، ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٤٤)ی (٤)ی کانونی یەکەم ١٩٧١.

٤٥ –لەگەڵ کامەراندا، ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (١٦): ٤.

٤٦–زەبری هۆنراوەو کارەساتی چڕنوك گرتن، زمناکۆ، ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٤٦)ی (١٨)ی کانونی یەکەم ١٩٧١.

٤٧ –کۆڕێك بۆ ڕوانگە خوازەکان، ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٦)ی (٢)ی شوباتی ١٩٧١.

٤٨ –دیوانی کامەران موکری: ٢٩٨.

٤٩ –سەرچاوەی پێشوو: ٣٢٥.

٥٠ –سەرچاوەی پێشوو: ٢٨٠.

٥١لە کۆڕێکی (نیسانی ساڵی ١٩٨٣)وە وەرگیراوە کە لە هەولێر بۆ کامەران گیرابوو.

٥٢–لە کۆڕێکی (مارتی ساڵی ١٩٧٩)وە وەرگیراوە کە لە سلێمانی بۆ کامەران گیرابوو.

٥٣ –لەگەڵ کامەراندا، ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (١٦): ٤.

٥٤ –سەرچاوەی پێشوو: ٤.

٥٥ –سەرچاوەی پێشوو: ٤.

چیرۆك

# له بیابانێكدا

كامەران موكری

وەك كڵپەی دوایی بێت و بكوژێتەوە، ڕۆژ ئاوا كڵپەی ئەسەند، گــڕی بــه هــەموو لایــەكدا بڵاوئــەكردەوەو تیشــكه وەك تــیری ئاگرینەكانی ئەچەقانه سەر سنگی بیابانی سوتاو. ئاسۆی بیابان و ئاسمــان پێكگــەیینی خوێنینــی ســامی ئەنایــه دڵــی هــەموو گیانلەبەرێك. گەرما شەپۆلی ئەدا. لمی سوتاوی ئەو بیابانه به دەم باوه لێك دوورئەكەوتنەوەو خۆیان به دەمیەوه سوك ئـەكرد وەك لەوه بترسن كه بەیەكا بخرێن و یەكجاری ببن به قەقنەس. گەرما شـەپۆلی ئـەداو بـاش وەك تـیری ئاراسـته كـراوی بـۆ سـەر زەوی ئاڵتونی ڕەنگ مەیلەو ئاگر، بەناو شەپۆلی گـەرمادا تێپـەڕ ئـەبو، بیابانێكی چۆڵ.. نه كەسی تیابوو، نه گوێـت لـه دەنگـی كـەس ئەبوو با یاری بەو بیابانه بێگیانه سوتاوه ئەكرد.. ڕۆژیش پـەیتا پــەیتا ئـاگری تێبەرئـەداو بـاش وەك گاڵتــەی پێبكـات، دەمێــك كۆمــەڵێ گردۆڵكــەی لێ دروسـت ئـەكردو دەمێك كۆمـەڵێكی تێـك ئەدایەوه. ئـەو بیابانـه چۆڵـه ماتـه لـه دەمێكـەوه خنكـابوو، دارو درەختی ئەگەر تیابوبێ لەناو جەرگی لمیا دەمێ بوو ناشتبووی، كەس دیار نەبوو، دەنگی هیچ گیانلەبەرێك نەئەهات.. تا چاوبڕی ئەكرد هەر بیابان بوو هەر لم.. هەر لم بوو هەر بیابان، لەپڕ دەنگێك پـەردەی بێدەنگی بیابانی دڕیو شـەپۆلی گـەرمای شێوان و خـۆی تێكـەڵ بـه بـای گـەرمی سـوتێنەر كـرد.. دەنگێـك.. دەنگێكـی زۆر بەسۆز. جگەربڕ، دەنگی لاوێك، لاوێكی دڵ پڕ لە ئاوات.. دەنگی محەمەد كه به دەم گۆرانیەوه ئەیوت.

گیانەكەم ثریا

لەیلای من

دەمێكه لـه دەریای ئەشكی خوێنینا كەوتوومه پەلـەی مەلـە. ئـاخ گیانەكـەم دەمێكه لێـك دووری چنگــی قولاپــی لــه جــەرگی هـەردووكمان گیركردوه، تاسـەی دووریت وەك ئـەم بیابانه ئـاگری تێبـەربوه، ئاگری تێبـەرداوم.. هاكا هاكا منیش وەك ئـەم بیابانـه سوتام بووم به خۆڵ.. نەمام لەیلای من.

تینووم ڕێگاكەم دووره.. گەورما هێرشێكی بێ ئامانی بردومه سەر، بـەڵام نـەء.. نـەء.. قەیناكات قەیناكات بەرگه ئەگرم، بەرگــه ئەگرم تا تینویەتیم به ئاوی سەرلێوی گوڵیت ئەشـكێنم. ڕێگـام هەرچەنده دوور بێت یادی ڕووی گەشت نزیكی ئەكاتـەوه. گـەرما هەرچــەنده بــێ ئامــان بێــت بــه هیــوای ئــەوەوه بــه باوەشــێنی ئەگریجــەی ڕەشــی قــەترانیت فێنــك بمــەوه.. بەرگــه ئــەگرم. بەرگه ئەگرم.

لەیلای من، ئای چەندم خۆش ئەوێیت، نه گەرما، نه سزا نه هیچ ناسـۆرێك خۆشەویستیشم لـەبیر ناباتـەوه، خۆشەویسـتیت بهاونه ناو كڵپەی ئەو ڕۆژەوه لێی ناترسم بسووتێ. ناسوتێ، تا خۆم نەسوتێم. خۆشەویستیت به قوڵی هەزاران گەز چاڵێكی لەم بیابانـەدا بۆ هەڵكەنن و تێی خەن نامرێت، تـا خـۆم نـەمرم. نـەء نــامرێت، ئەتەقێتــەوه، بیابــان بــه جــارێك ئــەوەندەی تریشــی ئەكاتـەوه. ئای خۆشەویستیت چەن بەرزه! هەموو ئاواتێكمـه لـه ژیاندا، شادیم دامێنی ئەو بائەدا.

محەمەد. به دەم گۆرانیەوه ئەوەی ئەوت و ئـەو بیابانه چۆڵـەی گرتبوه بـەر، لم لـەژێر پێیدا به كۆمـەڵ دەرئەپـەڕی و ڕای ئـەكرد، لەچكەكـەی بـەدەم بـاوه باوەشـی ئـەكرد بـه ڕوومــەتیا وەك لێــی بپاڕێتــەوه (ئاگــات لــه خــۆت بێــت نەتوێتــەوه) عەگاڵەكــەی وەك ڕەشمار خۆی بەسەرشانیا ئەداو وەك هانی بدات كـۆڵ نـەدات و وره بەرنــەدا، كەواكــەی لــه قــاچی ئــەئاڵاو ئــەژنۆی خــێرا خێرا ماچ ئەكرد.

محەمەد: گەنجێكی كەڵەگەتی ڕەنگ گەنمی كەمێ ڕەشی برۆ پەیوەستی چاوگەشی لوت بەرانی دەم مامناوەندی لچ ئەستوری ئێسك سوك بوو. لاوێك بوو له لاوانی بیابان. له كوڕه عەرەبە خۆگرتو گیان پۆڵاییینەكان. به تەنیا بێ ترس كەوتبوه ئەو بیابانه بەرەو ماڵی ثریا. لەیلای ئەو. بەرەو ماڵی ئەو دڵخوازه دڵ پڕ له ئاواتەی. سێ ساڵ بوو به دیداری شاد نەببوو. لورەی گورگ له دوورەوه هات و گێژەڵوكەیەك هەڵی كردو چەن گردێكی ڕوخان و چەند گردێكی تری له لایەكی ترەوه دروستكرد. لورەی گورگ له دورەوه هات و محەمەد له جێی خۆی وەستا. زمانی وەك ئێسقان له تینوانا ڕەپ ببوو. سنگی وەك موشەدەمه كەوته جوڵه جـوڵ، دەستی برد مەتارەكەی له كەمەری كردەوەو، به دەستێكی كەمێك لەرزۆكـەوه بـەرزی كـردەوه. بـەڵام لـەپڕ دەسـتی نایـه سـەردەمی مەتارەكه وتی: زۆر ئەترسم بەم زوانه نەگەمه لەیلا. زۆر ئەترسم ئاوم لێ ببڕێت و بخنكێـم. جـارێ بـادان بـه خۆمـدا بگـرم، بـا ئـاو نەخۆمەوه كه ژیانی من و لەیلای لەسەر بەنده. ئای ژیان ئـەم.. چۆڕه ئاوه چۆن بوه به هۆی ژیان و مردنی دوو كـەس. محەمەد

دەمی بە لم ئاخنرا، ئەوەندەی نەمابوو بخنکێت، ئەمجارەش مەتارە ئاوەکەی بەرزکردەوەو وتی: هیچ نەبێت چۆڕێك بخۆمەوە.. بەڵام هەمیسانەوە لەپڕ دەمی مەتارەکەی گرتەوەو کەوتەوە ڕێ.

لە هیچ جێیەکەوە نیشانەی ئاوایی دیار نەبوو، لورەی گورگیش نەما. محەمەد ئەژنۆی کەمێك سست بوو بەڵام هەر لە ڕۆیشتن کۆڵی نەدا. بە دەنگێکی کپ و خەمباری لماویەوە وتی: ئاخ خۆزگە ثریا تۆش ئێستا بەرێوە بویتایە خۆزگە تۆش بەرەو پیرم بهاتیتایە، تا لە پێش مردنما باڵم بئاڵاندایەتە گەردنت.. دەوەرە.. دەوەرە گیانەکەم.. وەرە پێڵوی چاومت بۆ ڕائەخەم بەسەریا بڕۆ.. دەوەرە گیانەکەم با دەم بنێمە سەردەمت و گیانم لەگەڵ ئەم دەم نانە سەردەمە دەربچێت. دەوەرە با ساتێك.. ساتێك پێش مردنم، ئەوەندەی چاوتروکاندنێك.. بە شادی بژیم ئەوسا دەم بە زەردەخەنەوە بمرم.. بەڵام نەء.. مەیە.. ئەترسم تۆش وەك من بمریت.. ئەگەرچی ئەشزانم، زۆر چاکیش ئەزانم کە لە پاش مردنی من تۆش ئەمریت.. بەبێ من ناژیت.. بەڵام لێرەدا، لەبەرچاوی خۆم، لەم بیابانەدا با نەمریت. با ئەو لەشە ناسکە جوانەت گورگ تێی نەوروکێت و هەتاو نەیکات بەم لمە.. نەء مەیە..

مەتارەکەی بەرزکردەوەو ئەمەندەی فرمێسکی ژنی بەدرۆ لە پرسەی بێگانەدا گریاو، یان شەونمی سەریەك پەڕەی نێرگس، ئاوی ڕژانە دەمیەوە، بەڵام ئەوەندە نەبوو کە قوڕگی لە قوڕ پاکاتەوەو کەمێك هیچ نەبێت دەنگی بەردات.

مەتارەکەی کردەوە بە کەمەریاو کەوتەوە ڕێ. لەپڕ دەستی کرد بە گریان.. ئەوەندە گریا قوڕگی ئەوەندەی تر نوسا کەچی خۆشی بە خۆشی ئەوت هەروەك لە بەردەمی بیابانی بە سامدا شەرمەزار بووبێت ئەیوت: زۆر شورەییە بۆ گەنجێکی وەك من بگریم.. بۆ ڕۆڵەی عەرەب. بۆ کوڕی بیابان ئاوا وره بەردا و فرمێسك بەردا وەك لێزمە بێتە خوارەوە.. بەڵام ئاخ.. لەپاش چەند هەنگاوێك چوە سەر تەپۆڵکەیەکی بەرز و ڕوانیە دوور یەکجار دور بە چاوێکی بە فرمێسك سور هەڵگەڕاوەوە وتی: ئەگەر چاوم درۆ نەکات لام وایە ئاواییە. ئەوانە دارخورمان. ئەوە ئاوایی ثریایە. ئینجا پڕ بە دەنگ وەك مەجنون هاواری کرد لەیلا لەیلا وا هاتم وا ڕێم گرتۆتە بەر. شەیدای دیداری چاوی بە خومارتم لەیلا، هەمیسان کەوتەوە ڕێ. بەڵام ئەمجارە زۆر بە گوڕ. زۆر بە چالاکی تا ئەژنۆی شل بوەوەو چوە پاڵ تەپۆڵکەیەك و دانیشت. مەتارەکەی لە کەمەری کردەوەو بەرزی کردەوە بۆ دەمی و وتی: ئەمجارە هەمووی ئەخۆمەوە سا یان دوایی ئەمرم لە تینوانداو یان ئەگەمە ئاوایی. دەمی کردەوە مەتارەکەی ڕێکی دەمی ڕاگرت خەریك بوو ئاوەکە برژێنێتە ناو گەرویەوە دەنگێك دایچڵەکان. دەنگێکی زۆر پڕ پاڕانەوە. دەنگی یەکێك لەو زیاتر لێقەوماو. یەکێك لە تینواندا تۆزێکی مابێت بخنکێت دەنگی ژنێك. محەمەد دەمی مەتارەکەی داخستەوەو بێ ئەوەی دڵۆپێك ئاوی لێ بخواتەوەو کردیەوە بە کەمەریاو بە دەم دەنگەکەوە چوو، کە



سەیری کرد ژنێکە لەپاڵ تەپۆڵکەیەکدا ئەتلێتەوەو قژی خۆی ئەڕنێتەوەو ئەگری. ئەگری و هاوار ئەکات: خنکام. خنکام لە تینوانا.. خنکام.. ئای بۆ گیان لەبەرێك فریام کەوێت.. ئای بۆ قەلێك لە پێش ئەوەدا بمرم و بەربێتە لاکم بە دەنوك ونجڕ ونجڕم کات، تۆزێك تف بتکێنێتەوە ناو دەممەوە.،

محەمەد لێی نزیك بوەوە وتی: خوشکم!

لەپڕ ژنەکە ڕاپەڕی و چنگێ قژی کردەوەو هاواری کرد: برام فریام کەوە. محەمەد بە دەنگێکی کپ بووی نوزە بە ئاستەم تیاماوەوە وتی: هەر کەسێك بیت بە فریات کەوتوم. مادەم ئینسانێکیت. ئینسانێکی بەسزمان.. لێقەوماو.

ژنەکە وتی: من حەلیمەی طلیجم، لەگەڵ دوو سێ براو ئامۆزامدا لەم بیابانەدا کەوتبووینە ڕێ، لەپڕ گێژەلۆکەیەکی

یەکجار سەختی هەڵکرد.. ولاخەکەم هەڵی گرتم، لە پاشدا فڕێی دامە خوارێ کە تەپوتۆز نەماو سەرم هەڵبڕی دیم کەس دیار نیە، کەس لە دەورم نەماوە.. هەرچەند هاوارم کرد، هەرچەند بانگم کرد کەس بە دەنگمەوە نەهات.. نازانم ئەوان چییان لێهات و بۆ کوێ چون! بێگومان ئەوانیش ڕێیان هەڵەکردوەو بەدوای مندا وێڵن.. ئەمەی وت و سەری کەوتە سەرشانی محەمەد. محەمەدیش مەتارەکەی لە کەمەری کردەوەو لەبەر خۆیەوە وتی: با من بمرم ببم بە قوربانی ئەم بەسزمانە.. ئەنجا بە دەنگێکی کەمێك بەرزەوە وتی:

خوشکم دەمت بکەرەوە.

ژنەکە دەمی کردەوە محەمەد مەتارەکەی بەرزکردەوەو هەموو ئاوەکەی ڕژاندە ناودەمی حەلیمەوە. حەلیمە ئاوەکەی هەموو خواردەوە، چۆڕبڕی کرد.. محەمەد دەستی کەوتە لەرزین.. بەرەبەرە سست بوو.. لەپڕ پەنجەکانی کرایەوەو مەتارەکەی لە دەست کەوتە خوارەوەو بەلادا هات.. مرد.

حەلیمە ڕاپەڕی و هاواری کرد: براکەم. ئاخ مردیت؟ مردیت لە پێناوی مندا؟ لە پێناوی منا کە نامناسیێت؟ خۆت تینوت بوو، ئاوەکەت دا بە من؟ ئاخ.. ئاخ.. کاشکا من بمردمایە ئاخ.. هاوار بکەم ئاخ لە پێناوی منا مردیت. منیش هەرگیز نە چاکەم لەگەڵتا بوەو نە دیومیت.. نەمناسیویت.. ناتناسم.. نامناسیت ئای چەند بەزریە ئەم مردنە.

لەگەڵ تەپ و تۆزێکی بێ شوماردا دوو سێ سوار دەرکەوتن. نزیك بونەوە گەیشتنە لای حەلیمە. ئەوانە کەس و کاری ئەو بوون. کەس و کاری حەلیمە. یەکێکیان هاواری کرد: حەلیمە ئەوە کێیە لەلات پاڵکەوتوە؟ حەلیمە هاواری کرد: لە پێناوی منا مرد، مردوە، نایناسم، یەکێك لە سوارەکان بە لەپی دەست ئارەقەکەی سڕی و وتی: ئەمە محەمەدە.

بە هەموویان بە چەك چاڵێکیان بۆ هەڵکەندو ناشتیان. حەلیمە دەسی کرد بە شیوەن و سنگ کوتان و سوارەکانیش فرمێسکیان بە لێشاو ئەڕشتە سەر گۆڕی محەمەد، بۆ محەمەدی مەرد. حەلیکە ڕزگاری بوو، محەمەد مرد، محەمەد بوو بە قوربانی حەلیمە.

سوارەکان ڕۆیشتن، با نیشانەی گۆڕەکەی تێك دایەوەو لەگەڵ بیاباندا تەختی کردەوە. نیشانەکەی لەسەریان کێشا کوژایەوە نەما. ونبوو. بەلام ناوی محەمەد ئێستاش لەناو خێڵەکانی عەرەبدا بتە ئەستێرەی پرشنگداری ئاسمانی دڵسۆزی و قوربانی. بوە نمونەی قوربانی ڕاست و بێ ڕیاو پاداش.

نوسینی: حمه احمد طه

---

بەشی یەکەمی ئەم چیرۆکە لە ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١١٣٩) ساڵی ٢٨ پێنج شەممە ٥/ی مارتی ١٩٥٣دا بلاوکرایەوە.

-بەشی دوەمی لە ژینی ژمارە (١١٤٠) ساڵی ٢٨ پێنج شەممە ١٢/ی مارتی ١٩٥٣دا بلاوکرایەوە.

-بەشی سێیەمی لە ژینی ژمارە (١١٤١) ساڵی ٢٨ پێنج شەممە ١٩/ی مارتی ١٩٥٣دا بلاوکرایەوە.



# نانی سیلاوی

ئەگریا.. منالێکی نۆ ساڵەی چڵکن بوو، گریانێکی ئێجگار تاڵ و بە کوڵ ئەگریا، دایە گیان.. بە دەم قوڵپی گریانەوە چنگی ئەکرد بە خۆڵەکەداو ئەیوت:

دایە گیان بۆ نەهاتیتەوە!

فرمێسکی بە گوڕی ڕومەتە زەردە خۆڵاویەکانی ئەشت، جلەکانی لە چڵکنیدا وەك پارچە مشەمایەکیان لێهاتبوو. هەردوو چاوی وەك دوو گێلاس سورهەڵگەڕابون، قاچی ئەمەندە ژەنبو لە ئەرزەوە هەموو توێخی پاژنەی چوبوو، دەستیشی ئەمەندە لە ئەرز گیرکردبوو بنی نینۆکەکانی خوێنیان لێ ئەتکا. ئەگریا.. ئەگریاو بە هەموو هێزێکیەوە قەپاڵی لە ئەژنۆی خۆی ئەگرت و لێوی خۆی ئەکرۆشت، ئەگریاو بە دەنگێکی زیلەوە پڕ بەو کۆڵانە ئەیقیژاند.. ئەمەندە ئازاری خۆی دابوو، ئەمەندە گریابوو، ئەمەندە لە خۆی

دابــوو ببـــوو بـــە پارچەیـــەك خوێـــن و خـــۆڵ و هەنســـك و فرمێسك و ئاخ.

منـاڵێك بـوو برسـیی بـوو بـە دەم گریانـەوە هـاواری ئـەکرد (برسیمە بۆ نەگەڕایتەوە!) پەیتا پەیتا دەستە دەستە خەڵك بەوبەر ماڵەدا ئەهاتن بەبێ ئەوەی کەسێك بڵێت ئەو منالە بۆ ئـەگری!! منالەکـەش جارجـار ئـاوڕێکی دواوەوەی ئەدایـەوەو سـەیری گەنجینە تاریکەکەیانی ئەکرد، سامێکی زۆری لێئەنیشت و تۆزێك نزیك ئەبوەوە لە کۆڵان وە جار جاریش کە چـاوی بـە خەڵکەکـە ئەکـەوت کـەس گوێـی ناداتـێ، هـەروەك تـەریق بێتـەوە تۆزێـك ئەچووەوە دواوە بۆ ناو حەوشەکەیان.

ئەگریا، ئەگریا بـۆ نـان، ڕەنگـە زۆر کـەس کـە نـەزانن دەردی برسـیەتی چـەند گرانـە..، نـان چـەند بەنرخـە، ڕەنگـە.. پێبکـەنن ڕەنگـە بڵێـن: نـان ئـەو هـەموو گریانـە، ئـەو هـەموو خۆکوشـتن و هاوارەی بۆ چیە؟

ڕۆژ هـەر ناوچـەوانی لـە دەم کەلـەوە دیـار مـابوو، شـاخەکانی ئەوبـەر تـەوقی سـەریان زەرد زەرد ببـوو، کۆڵانـەکان وردە وردە بەرەو لێڵی و تـاریکی ئـەچون، جادەکان بەرە بـەرە بـەرەو چۆڵـی ئەڕۆیشـتن. شـار لـە بێدەنـگ بوونـا بـوو، خـەڵکی زۆری لـــە نـان خواردنـــدا بـــوون بـــەڵام هێشـــتا دایکـــی ئـــەو بەســـزمانە هـــەر نەگەڕابوەوە. لە کوێ بوو؟ لە شایی؟ لە سەیران؟ لـە مـاڵان؟ نـەء. ئەی لە کوێ..؟

باجی پیرۆز کە پشتی وەکو کـەوان چەمابوەوە دەقی گرتبوو، پەنجەکانی وەك کولەوژی گرێ گرێ وابوون. ئەگریجـەی هـەمووی دوو سێ چەپکە قژی سپی چڵکن بوو، بە هەموو لایەکدا ئەلەرزی، لە کوڕەکە نزیك بوەوەو پووکە سواوەکانی دا بەیەکاو وتی: ئـەرێ کوڕم بۆ ئەمەندە ئەگریت؟ بەڵام کوڕەکە لـە جیاتی وەرام ترسێکی زۆری لێنیشت و لەپڕ چنگێ قژی کردەوەو وتی: باجی پیرۆز!!!

منالانی گەڕەك ئایەنوت باجی پیرۆز جار جار ئەبێت بە جنۆکە یـان خێـو وە کـە فرسـەتی دێ منـاڵ ئـەخوات، بـە تایبـەتی ئـەو منالانـەی ئەگرین. جا لەبـەر ئەمـە بـوو کـە ئـەو منالـە ئـەوەندەی نـەمابوو زەندەقـی بچـێ و بتۆقێـت. منالەکـە بـە تـەواوی نـاو دەرگاکەی بەجێهێشت و ڕایکردە کۆڵان، بۆ ئەوەی ئەگـەر شـتێ بـوو ڕێـی ڕاکردنـی ببێـت.. بـاجی پـیرۆز بـە زەردەخەنەیـەکی ترسناکەوە وتی: کوڕم بۆ ئەوەندە ئەگریت؟ منالەکە لە ترساندا خۆی نوسان بە دیوارەکەوەو چاوی ئەبڵەق بوو لـە جێـی خـۆی وشك بوو. باجی پیرۆزیش کە ئەمەی دی پشتاوپشت گەڕایەوەو لەبەر خۆیەوە وتی: وا دیارە دایکی نەگەڕاوەتەوە.. ئـەمیش زۆری برسیە بۆیە ئەگری.

باجی پیرۆز بە تەنیا لە ژوورێکی تاریکدا ئەژیا لە سوالەتێك و حەسیرە شڕێك و پەتێك زیاتر هیچی نەبوو.. خـەڵکی شتیان بـۆ ئەبرد بیخوات. باجی پیرۆز کە گەڕایـەوە ژورەکـەی خـۆی کـە لـە ئەشکەوتێکی بچوك یان کونە گورگێك ئەچوو، تۆزێك ترخێنـەی کۆنی کردە سوالەتەکەیەوەو لەگەڵ لەتێك نانـدا بە منالێکدا ناردی بۆ منالە برسیەکە.. ئەویش هەر لە کۆڵانەکەدا دانیشت و دەسـتی کرد بە خواردن.. بەڵام ئەوەندە نەبوو تێری پێبخوات.

لـەم کاتـەدا ژنێك کـە خـەڵکی ئـەو گەڕەکـە نـەبوو بـەڵام بـاجی پیرۆزی ئەناسی لەلای هەڵتروشکاو وتـی: ئـەو منالـە بـۆ ئەمـەندە ئەگری! ئایا دایکی نیە.. یان لەوێ نیە؟

بـاجی پیرۆز بە بۆڵە بۆڵەکەی خۆیـەوە وتـی: دایکـی هەیـە.. بەڵام لەوێ نیە.. ئەو منالـە بـاوکی توشـی دەردە خراپەکـە بـوە، نـوری محمـدی شـەریف سـیل.. ئـەوە دوو سـاڵی ڕەبەقـە پێـوەی ئەنالێنێت، هـەموو ڕۆژێکیش لـەو وەختـەوە لـە خەسـتەخانەیە.. دایکی ئەو منالـە ئەچێتە لای مێردەکەی‌و تا دەمە دەمی ئێـواریٚ لەوێ ئەمێنێتـەوە ئینجا ئەگەڕێتـەوە. قاپـێ چێشـتی خەسـتەکان دێنێتەوە بۆ خۆی و منالەکەی. ژنەکە چنگێ قژی کردەوەو وتـی: چێشتی خەستەکان؟ چۆن نانی سیلاوی.. نانی بەردەمی سیلدار ئەخۆن. گوایە نازانن خراپە؟

بـاجی پـیرۆز وتـی: ئـەی ئەگـەر نـەیخۆن چـە بکـەن؟ هیـچ کەسێکیان نیە پارویەك نانیان باتێ، هیچیان لەماڵدا نیە. لە من هەژارتر ئەوانن. ئەی ئەگەر ئەوە نەخۆن چی بکەن! بێ شێو سـەر بنێنەوە؟ بمرن؟ بمرن؟ منالەکە دەسی کردەوە بە گریـان. ئـەمجارە ئێجگاری پەشۆکاو دەنگی لێ هەڵبڕی.. چونکە تەواو تاریك داهات بەڵام دایکی هەر نەگەڕابوەوە.

ژنەکـە چـوو بـۆ لای منالەکـە لەویشـی پرسـی: بـۆ ئـەگریت منالەکـــــە وتـــــی دایکـــــم هێشـــــتا نەهاتۆتـــــەوە.. منیش زۆرم برسیە.. زۆر.

بەم جۆرە هـەژاری دەسـی‌ناوەتە بینـی هـەزاران هەزارانـەوە، وە برسێتی و بە دەم سزاوە بە سیل ئـەیانکوژێت و دەسـتە دەسـتە وەك گەڵای پاییز هەڵئەوەرێن. ئاخۆ کەی بێت ڕزگاریان بێت.

لـەپڕ لـە تـاریکیدا دایکـی منالەکـە دەرکـەوت.. منالەکـە بـە گریانەوە چوو بە پیریەوەو هاواری کرد: دایە گیان هاتیتەوە؟ ئەی کوا چێشتەکەم؟

دایکی دایە پرمەی گریان و وتی: باوکت مرد!

باوکی مرد.. ئەو نانەش بڕا.. نانی سیلاوی

**نوسینی: حمە- سلێمانی**

---

بەشی یەکـەمی ئـەم چیرۆکـە لـە ڕۆژنامـەی ژیـن ژمـارە (١١١٩) سـاڵی ٢٧ پێنـج شـەممە ١٦/ی تشـرینی یەکـەمی ١٩٥٢دا بڵاوکرایەوە.

بەشـی دوەمیشـی لـە ژینـی ژمـارە (١١٢٠) سـالی ٢٧ پینـج شەممە ٢٣/ی تشریتی یەکەمی ١٩٥٢دا بڵاوکرایەوە.

لێکۆڵینەوە

# ئـەفســـانـە

**کامەران موکری**

ئەفسانە بریتیە لە هەوڵی مرۆڤ بۆ ئەوەی لە گەردوون و دیاردەکانی بگات، یاخود بریتیە لە لێکدانەوەی مرۆڤ دەربارەی ئەو دیاردانە، بێگومان بەرهەمێکە زادەی خەیاڵ، لەگەڵ ئەوەشدا لە چەمکێکی دیاریکراو و فەلسەفەیەکی سەرەتاییەوە پەیدابوە، واتا ئەو فەلسەفەیەی کە لەوەوە زانست و فەلسەفە گەشەی کردوەو گۆڕاوە، بەم پێیە ئەفسانەی گەردونی (کە چەشنێکە) لە ئەفسانە، هەروەك فەلسەفە لە یەکەم قۆناغیدا لە سەرنج دانەوە پەیدا بوە لە دیاردەکانی گەردون سەرنجدان و ڕامانیش سەرسوڕمانی لێ پەیدا دەبێ سەرسوڕمانیش پرسین، پرسینیش وەڵامی ئەوێ مرۆڤیش کە وەڵامی خۆی دایەوە دڵنیا دەبێ، بەم پێیە دەتوانین بڵێین کەوا ئەفسانە بریتیە لە دەربڕین یاخود دەرپەڕاندنی خولیای پەستاوتوی دەرونی لە شێوەیەکی بابەتیدا، ئەم کارەش هەر بۆ ئەوە سازدراوە کەوا ترس و دوودڵی مرۆڤ کەم بکاتەوەو نەیهێڵێ[1].

مرۆڤ ئەفسانەی کردوە بە هۆیەك بۆ ئەوەی شەقڵی بیروباوەڕ بدات لە تاقیکردنەوەی ژیانی خۆی و واتایەکی فەلسەفی ببەخشێت بە ڕاستەقینە ئاساییەکانی ژیانی تا دڵنیابێ بەرامبەر بەو هەموو پەنهانیەی لە گەردوندا هەیەو دەستی ناگاتە ئاشکراکردنی و بەم هۆیەوە ویستویەتی خۆی لە ترس ڕزگار بکات، بۆ نموونە ئادەمیزاد لە تاریکی ترساوەو ڕوناکی ڕۆژی خۆشویستوە، بۆیە ڕۆژی پەرستوەو تاریکی داناوە بە نیشانەی خراپە بەم جۆرە دیاردەی شەو و ڕۆژیان داناوە بە بەگژاچونی هێزی تاریکی و ڕوناکی، بە شەو تاریکی سەر ئەکەوێ و بە ڕۆژ خۆر[2] ئەفسانە کە بریتیە لە جۆرە وشیارییەکی کۆمەڵایەتی مرۆڤ بریتیە لە هەوڵدانێ (وەکو دەرمانخست) بۆ تێگەیشتن لە پەنهانیەکانی گەردون، بۆ تێگەیشتن یاخود لێکدانەوەی دیاردە سروشتیەکان و پەنهانی مان و نەمان، ئەم دەربڕینانە خراونەتە شێوەی چیرۆکێکەوە، کە سەرەتاو گرێ و کوتوپڕی و ئەنجامی هەیە.

ئادەمیزاد چۆن دەیەوێ وەڵامی پرسیارێ، یان چاری کێشەیەکی بۆ دەرکەوێ بەوەی لە یەکێ دەپرسێ، یاخود ئادەمیزاد چۆن لە خەودا هەستی دەرونی لە ترس و ئارەزو وروژم دەباتە سەری لە شێوەی وێنەو ڕەمزدا بەم جۆرە لەو سەردەمە سەرەتاییەشدا کە ئەفسانەی تیا لەدایکبوە، بریتی بوە لەو هەستە دەرونیانە کە ئادەمیزاد بە شێوەی بەسەرهات و چیرۆك نیگاری کێشاوە، ترس و ئارەزوی خۆی تیا دەربڕیوەو، وەڵامێکی بۆ خۆی دۆزیوەتەوە[3].

ئادەمیزادی سەرەتایی بیری لە کردگار نەکردۆتەوە، لەو ڕوەوە بزانێ کردگار چییە، بەڵکو ویستویەتی بەو هۆیەوە بیر لە دیاردەکانی سروشت بکاتەوە، باران بۆچی دەبارێ چۆن دەبارێ، بروسکە چییە.. گژوگیاو ڕوەك، بەم پێیە ئەم بونەوەر و دیاردانەی بەستەوە بە هێزانی نابینراوەوە، لەبەرئەوە بیری لەوە کردۆتەوە کە هەمیشە ئاشت بێت لەگەڵ ئەو هێزانەدا کە ئەو تێیان ناگات و نەریتی بۆ خۆی دانا سەبارەت بەو دیاردە سروشتیانە و گەلێ بۆنەی داهێنا، وەکو بۆنەی باران بارین یان لافاو.. هتد ئەمجا دەتوانین بڵێین کەوا ئەفسانە بریتیە لە وەسفکردنی ئەو بۆنەو نەریتە گیانیانە یان بڵێین ئاینییانە و یاخود بریتیە لە سەرگوزشتەی ئەو بۆنەو نەریتانەی بەندیان کردون بەو دیاردە سروشتیانەوە.

ئەفسانە بەرهەمی مێشکی، یان لێکدانەوەی مرۆڤی ئەو سەردەمەیە کە یەکجار بێ دەسەڵات بوە بەرامبەر بە ڕوداوە سروشتیەکان، بێ توانا بوە لە لێکدانەوەی ئەو دیاردەو ڕوداوە سروشتیانەدا بۆیە ناچار بوە (وەکو وتمان) لە ڕێی ئەفسانەوە هەستی دەرونی خۆی هەڵڕێژێ تا دڵی ئارام بگرێ لە گەردون و سروشتێکدا کە ئەو بە ترسەوە تیا دەژی، کەواتە هەر ئەفسانەش بوو کە خواوەندی لە مێشکی مرۆڤدا دروست کرد، وەکو خواوەندی شەڕ، ئاشتی، بەهار، جوانی.. هتد.

مرۆڤ کە بەو شێوەیە ژیانی دەبردە سەر، واتا لە گێژاوی لێکدانەوەدا بوو بەرامبەر بەو هەموو پەنهانییانەی ژیان ئەفسانەی دەچنی و بە جۆرێکیش کە خۆی سەرکەوتوو بێ، بۆ ئەوەی لەو ترس و دوودڵیە ڕزگاری بێ کە گیرۆدەی بوە، یاخود ئەو هێزە لە ئەنجامی ئەفسانەدا سەردەکەوێ کە لایەنگری مرۆڤە، یان بڵێین

هێزی چاکەو ڕوناکیە و ئەگەر ئەنجامێکیش بەو چەشنە نەبێ ئەوا هەر مەبەست پەند وەرگرتنە.

وەکو وتمان ئەفسانە لێکدانەوەی مرۆڤی سەرەتاییە دەربارەی گەردون و سروشت و جیهان و ڕوداو و دیاردەکانی ژیان و پەنهانی مردن و.. هتد کەواتە: دەربڕینی هەستی مرۆڤی سەرەتاییە.

**چەشنەکانی ئەفسانە:**

ئەفسانە بریتیە لە چەند چەشنێ کە ئەمانەن:

١-ئەفسانەی نەریت و بۆنە ئاینیەکان:

ئەفسانە، نە بۆ کات بەسەربردن پەیدابوە، نە بۆ تام لێ چەشتن، بەڵکو پێویستیەك بوە، لە پێویستیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤی سەرەتایی و ئەم چەشنە ئەفسانەیە بریتیە لە لایەنی قسەی، یان دەربڕینی زاری ئەم بۆنەو نەریتە ئاینیانە، بایەخێکی گەورەی بوە لەوەدا کە نەریت و بۆنەکانی بە سۆز و کاریگەرانە خستۆتە کایەوەو بەسەری بردوەو سازاندویەتی، هۆیەك بوە بۆ چەسپاندنی باوەڕ سەبارەت بە دیاردەکانی بونەوەری. لەم چەشنە ئەفسانەیە، ئەفسانەی ئۆزیریسی میسری دەخەینە پێشچاو کە دەربارەی پەنهانییە بوون و نەمان دەربارەی (گیان) دەدوێ[٤].

**نموونە:**

ئەفسانەی (ئۆزیریس)، کە ئەفسانەیەکی میسرییە دەڵێ:

ئۆزیریس کە خواوەندی پیت و بەرەکەتە لە کۆتایی پیت و بەرەکەتی زەویدا دەمرێ ئەمجا لەگەڵ گەڕانەوەی پیت و بەرەکەتیدا زیندو دەبێتەوە، لەسەر تەخت دادەنیشێ و بڕیار دەدات لەسەر چارەنوسی ئەو گیانانەی کە ژیانیان بەجێهێشتوە ئەم ئەفسانەیە پەیوەندیی بە نەریتی مردوو مۆمیا کردنەوە هەیە، ئەفسانەکە دەڵێ:

ئۆزیریس کوڕی زەمین بوو، (ئیزیس)یش کە هاوبەشیی دەکرد لە کردەوەی چاکەدا، ژنیشی بوو (سیث) پیلانێکی لە ئۆزیرسی برای کردو توانی بیگرێ و بیخاتە سندوقێکەوە و فڕێی بداتە ناو ڕووباری نیلەوە، بەڵام (ئیزیس) لاشەکەی دۆزییەوەو دیسان (سیث) لاشەکەی فڕاندەوەو پارچە پارچەی کردو هەر پارچەیەکی توڕدایە شوێنێ، بەڵام ئیزیس پارچەکانی دۆزیەوەو تێکی خستەوەو گیانی بە بەردا کردەوە، بەڵام ئۆزیریس زەمینی بەجێهێشت و بوو بە پاشای ئەو شوێنەی کە گیان زەمینی تیا بەجێ دێڵێ[٥].

**٢-ئەفسانەی گەردونی:**

ئەرکی ئەم ئەفسانەیە ئەوەیە کە بە پێی لێکدانەوەی مرۆڤی سەرەتایی دەری بخات کەوا چۆن ئەم گەردونە دروستبوە، نمونەی ئەمەش ئەم ئەفسانە بابلیەیە:

لە پێش دروستبونی ئاسمان و زەمیندا، توخمی ژیان هەبوە، ئەم توخمە ئاوێتەیەك بوە، لە نێرینەو مێینە، توخمە نێرینەکە لە ئاوی شیریندا بوە کە ناوی (دایشۆ)یە، هی مێینەش لە ئاوی سوێردا کە پێی دەوترێ (تیامە) کە ئەم دوو توخمە تێکەڵ بوون (مومو) لەدایك بوو، کە بریتیە لە (وشە) و لەم سیانە نێرینەیەك پەیدابوو کە (لکسمبۆ)یە، مێینەیەکیش پەیدابوو کە (لکسامۆ)یە، لەم دوانەش (ئەنشار) دروست بوو، بە واتا جیهانی سەروو، و کیشاریش دروست بوو واتا جیهانی خواروو، ئەمجا سێ لۆنەیەکی تر دروست بوو لە (ئەنۆ) خواوەندی ئاسمان و (لەیل) خواوەندی زەمین و (ئەیا) خواوەندی ئاو و ئەمجا ناکۆکی کەوتە نێوان (ئەبسۆ) کە یەکێ بوو لە خواوەندە گەورەکان لەگەڵ هەندێ خواوەندی بچووك، لە ئەنجامدا شەڕ هەڵگیرسا، لەم شەڕەدا (مەردۆك) بەسەر (تیامە)دا سەرکەوت ئەمجا مەردۆك ویستی کارێکی گەورە بکات، ئەویش ئەوەبوو کەوا هات لاشەی (تیامە)ی کرد بە دوو لەتەوە، لە لەتێکیان ئاسمان و لە لەتەکەی تریان زەمینی دروستکرد، ئەمجا دوای ئەوەی ئەم کارەی تەواوکرد، ساڵی کرد بە (١٢) مانگ و کەوتە دروستکردنی ڕۆژو مانگ و ئەستێرەکان و ڕوەك گیانلەبەران پاش ئەمانە مرۆڤی دروستکرد، لە قوڕو لە خوێنی خۆی[٦].

**٣-ئەفسانەی هێمایی:**

ئەم چەشنە ئەفسانەیە لە قۆناغێکدا پەیدابوە، پێشکەوتوتر لەو قۆناغەی کە ئەفسانەکانی پێشوی تێدا پەیدابوە، ئەم چەشنە خۆی نابەستێتەوە تەنیا بە گەردونەوە بەڵکو لە ناوجەرگەی ژیانی ئادەمیزادەوە هەڵدەقوڵێ، هەروەها گرنگترین توخمی سەرەکی ئەفسانەی تیایە وەکو (خواوەندەکان)، سروشت ئادەمیزاد، پەیوەندیی کۆمەڵایەتی.. هتد.

بۆ ئەم چەشنە، ئەفسانەیەکی (ئیغریقی)ی دەکەین بە نموونە. نموونە: فینۆسی خواوەندی جوانی قینی زۆر لە (بسیشیە)ی کچی پاشا هەستا، چونکە خۆی بە جوانتر دەزانی لەو، لەبەرئەوە بە کیۆبیدی کوڕی وت بیکوژێ، کیۆبیدی چوو، بەڵام هەرکە چاوی بە کچە کەوت شەدای بوو، ئەمجا لە جیاتی ئەوەی بیکوژێ ماچێکی کرد و گەڕایەوە، دوای ماوەیەك ڤینۆس پێی زانی کەوا (بسیشیە) ماوە.

لەبەرئەوە تارمایی ترسناك و پەلەوەڕانی بە وەزنی دڕندەی نارده سەر تا بەجۆرێ بۆژۆو هەراسانیان کرد، بڕیاری دا خۆی بکوژێ، لەبەرئەوە چوە سەر لوتکەی شاخێکی بەرزو لەوێوە خۆی فڕێدایە خوارەوە، کیۆبید لەم کاتەدا کە ئەو خۆی فڕێ دەداتە خوارەوە، لەوێدا دەبێ و دەستبەجێ داوا لە خواوەندی (با) دەکات ڕزگاری بکات (با)ش بە نەرمونیانی هەڵی دەگرێ و دەیبات بۆ ناو دارستانێکی دوور، لەم دارستانەدا کیۆبید زوو زوو

سەری لێدەدات، بەڵام بە شەو نەبوایە نەیدەوێرا بچێ بۆ لای، لەبەرئەوە (بسیشیە) ڕووی کیۆبیدی نەدەدی بۆیە تکای لێ دەکرد کە هیچ نەبێ هەر یەك جار بە ڕۆژ سەری لێ بدات، بەڵام کیۆبید پێی دەوت ئەگەر بێتو بە ڕووناکی بچێ بۆ لای بێگومان لە یەك دەبن و نەك هەر ئەوەندەش بەڵکو ئەگەر بێتو هەر دەموچاوی ببینێ لە یەك دەبن، بەڵام بسیشیە زۆر بە عەزرەتەوە بوو کە بە ڕووناکی ڕووی ببینێ، شەوێ لە شەوان کە کیۆبید خەوی لێ دەکەوێ (بسیشیە) چراوگێ دائەگیرسێنێ و نزیك دەم و چاوی کیۆبیدی دەخاتەوە بۆ ئەوەی سەیری ڕووی بکات، لەم کاتەدا دڵۆپێ زەیت دەتکێتە سەر ڕووی کیۆبید، کیۆبید بە ئاگا دێت و دەستبەجێ ون دەبێ، ئەمجا ترس دڵی بسیشیە دادەگرێ و وێڵ دەبێ بە دوای دڵدارەکەیدا.

دوای گەڕان و بەسەرهاتێکی زۆری سامناك، دەگات بە (دیمتیر)ی خواوەند، کە چاوەڕێی کچەکەیەتی کە (برسفونیە)ی خواوەندی بەهارە، بۆ ئەوەی ماڵئاوایی لێ بکات پێش ئەوەی ڕووبکاتە جیهانی خوارو، چونکە بەهار لە کۆتاییدا بوو، هاوین بەڕێوە بوو، (دیمتیر) ئامۆژگاریی (بسیشیە) دەکات کەوا بچێ بۆ لای ڤینۆس و پۆزشی بۆ بێنێتەوە. (بسیشیە) دەچێ بەڵام ڤینۆس دەڵی ناتبەخشم تا ڕۆنی جوانیم لە وڵاتی مردوانەوە بۆ نەهێنیت. (بسیشیە) زوو خۆی دەگەیەنێتە (برسفونیە) پێش ئەوەی ڕووبکاتە جیهانی خواروو و بە هۆی ئەوەوە ڕۆنەکەی دەستدەکەوێت، بەڵام (برسفونیە) ئاگاداری دەکات کە نابێ سەری قوتوەکە بکاتەوە. بەڵام (بسیشیە) کە دێتەوە سەر زەمین سەری قوتوەکە دەکاتەوە، تا دەموچاوی خۆی پێ چەوربکات، هەر کە ئەمە دەکات خەوی لێ دەکەوێ کیۆبید دەگاتەوە سەری و بە ماچێ بە ئاگای دێنێتەوە، ئەمجا دەبن بە هاوسەری یەکتر[٧].

٤-ئەفسانەی قارەمانی خواوەند (قارەمانی بە خواوەند بوو) قارەمانانی ئەفسانەکانی پێشوو خواوەندەکانن بەڵام لەم چەشنە ئەفسانەیەدا قارەمانەکە ئادەمیزادە، بەڵام وەك ئاوێتەیەك لە ئادەمیزادو خواوەند، قارەمانانی چەشنە ئەفسانەکانی تر کە خواوەندن ئەرکیان ڕێکخستنی گەردون و سروشتەو بەڕێوەبردنی کاروباری وەرزەکان و دیاردە سروشتیەکانە، بەڵام قارەمانی ئەم چەشنە ئەفسانەیە لە لایەکەوە خواوەندێکەو لە لایەکی تریشەوە ئادەمیزادێك کە سیفەتە ئادەمیزادیەکانی بە ژیانی سەرزەمینەوەی دەبەستێتەوە، لە لایەکەوە وەك خواوەندێ سەیردەکرێ و دەپەرسترێ و لە لایەکیشەوە، ئادەمیزادێکە وەك ئادەمیزادەکانی کۆمەڵگاکەی خۆی، ئەمەش وەکو ئەفسانەی گلگامێش[٨].

ئەم ئەفسانەی گلگامێشە لەبەرئەوەی گەلێ وێنەی تیایە کە تا ڕادەیەك لە هی چیرۆکی پڕوپوچ دەچێ و هەندێك وێنەشی لە وێنەکانی ئەفسانە دەچن لەبەرئەوە هەندێ لە توێژەران بە چیرۆك هەندێکیشیان بە ئەفسانەی دادەنێن، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا گلگامێش هەر بە داستان ناوی دەرکردوە چونکە پڕیەتی لە قارەمانێتی مرۆڤ، بەڵام هەرچۆنێ بێ ئەم (چیرۆکە) نزیکترین چەشنە لەو چەشنە ئەفسانانەوە کە قارەمانەکانی ئادەمیزادن و لە پلەی خواوەندیدایە، بۆیە کردمان بە نمونە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دیسانەوە ئەوە ڕوون دەکەینەوە کەوا ناکۆکیەکی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی کە ئایا (گلگامێش) ئەفسانەیە یان داستان، چونکە لە ڕاستیدا سنوور دانان لە هەندێ بەرهەمدا (لە ئەدەبی فۆلکلۆریدا) گەلێ ستەمە بە تایبەتی سنوور دانانێ بۆ جیاکردنەوەی تەواوی ئەفسانەو (سەرگوزشتەی پڕوپوچ) لە یەکتری و بۆ جیاکردنەوەی ئەفسانە لە داستانی فۆلکلۆری، سەبارەت بەم ئەفسانەیەش (گلگامێش) لە لایەکەوە خاسیەتی داستانی تیا دەبینین کە قارەمانێتی گلگامێشەو، لە فۆڕمی وێنەدا تا ڕادەیەك ژیانی گەل و پەیوەندیی کۆمەڵایەتی پیشان دەدات و لە لایەکی تریشەوە بوونی خواوەندەکان کارێکی ئەوتۆ دەکات کە خاسیەتێکی بنەڕەتی ئەفسانەی بداتێ.

**گلگامێش:**

لە کۆتایی چەرخی نۆزدەیەمدا زانست دەستکەوتێکی گەورەی چنگ کەوت بەوەی کەوا زانایان چەند پارچەیەکی پچڕ پچڕیان لە ئەفسانەی گلگامێش دەستکەوت، لە کتێبخانەی کۆشکی پاشا ئاشوور پانیپاڵ لە نەینەوا، پایتەختی ئاشوریا کە دەکەوتە سەر ڕووباری دیجلە، بەرامبەر بە شوێنی ئێستەی شاری موسڵ، ئەمجا زانایان کەوتنە جموجوڵ تا ئەفسانەکەیان بە تەواوی دۆزیەوە، کە بە زمانی ئەکەدی نوسراوە، ئەم ئەفسانەیە ١٢ پارچەیە، لە کۆتایی هەر پارچەیەکیدا سەرەتای پارچەی دوای ئەو پارچەیەی تێدایە، ئەمجا لەبەرئەوەی لە کۆتایی پارچەی دوانزەیەمدا سەرەتای پارچەی تری تیا نەبوو، زانایان دڵنیا بوون کە ١٢ پارچەیە[٩] ئەفسانەکە خۆی بابلیە، توێژەران دەڵێن کەوا مێژووی کۆنترین دەستنوسی ئەم ئەفسانەیە بۆ کۆتایی دوەم هەزارەی پێش زاین دەگەڕێتەوە ئەم (گلگامێش)ەش پاشایەکی بابلی بوە لە کۆتایی دوەم هەزارەی پێش زایندا، (ورقا) پایتەختی بوە، لە ئەفسانەکەدا دەردەکەوێ کەوا گلگامێش شورەیەکی بە دەوری (ئورۆك) ورقا-دا دروستکردوە. یەکەم کەس کە ئەم ئەفسانەیەی بڵاوکردەوە (پاوڵ هاویت) بوو، کە لە ژمارە سێی گۆڤاری -کتێبخانەی ئاشوریا- ساڵی ١٨٨٤ز لەژێر ناونیشانی (دارستانی نەمرودی بابلیدا) بڵاوی کردەوە، ئەمجا دوای ئەو تا ئەمڕۆش شارەزایان هەر لەسەری دەنووسن[١٠].

**کورتەی ئەفسانەکە:**

گلگامێشی پاشای بابل (بە پێی ئەفسانەکە) کەتەیەك بوە زۆر بەهێز و بە توانا، گوایا سێیەکی ئادەمیزاد بوەو دوو بەشەکەی

تری خواوەند ئەم پاشایە شورەی بۆ شاری ئوڕوك كردوەو پەرستگەی پاكی ئینای دروستكردوە، خەڵكی لە زەبر و سامی هەراسان بوون و لە خواكان پاڕاونەتەوە كە یەكێكی تر دروست بكەن هاوشانی ئەم بێ، ڕۆژێ لە ڕۆژان لاوێ، كابرایەكی شوانی بۆرە زەلام بەدی دەكات زۆر بەهێز و بە سام، ڕادەكات ئەم هەواڵە دەگەیەنێ بە گەلگامێش، ئەویش دەڵێ ئافرەتێكی پەرستگای بۆ بەرە، با دابینی بكات، بەم جۆرە كابرا كە ناوی ئەنگیدۆیە دێننە شارەوەو دوای ئەوەی لە زۆراندا گەلگامێش دەیبەزێنێ، دەبن بە هاوڕێ، ئەم دوو هاوڕێیە تووشی سەدان چەرمەسەری و سەرچڵی و جەربەزەیی دەبن، لەگەڵ (خومیابا)دا كە یاساوڵی دارستان بوەو ویستویەتی ببێ بە خواوەندی چیا، لە ئەنجامدا، خومیابا دەكوژن، دوای ماوەیەك لە بێ ئارامی و خەم و ناسۆر و خەباتی سەختی گەلگامێش كە بە خواوەند دادەنرا بە یارمەتی ئەنكیدۆی هاوڕێی دژی دوژمنانیان، ئەنكیدۆ ئەمری گەلگامێش یەكجار خەمگین دەبێ، ئەمجا كۆتایی بەسەرهاتەكە بەوە دێت كەوا گەلگامێش دەگەڕێ بە دوای پەنهانیی نەمریداو لە كۆتاییدا ئەویش هەر وەك گشت مرۆڤان دەكرێ[١١].

لەم بەسەرهاتانەدا گەڵێ قارەمانی تری تیایە كە خواوەندن وەك خواوەندی ڕۆژو خواوەندی زەمین و هی ئاسمان و خواوەندی ئاوو.. هتد.

### ئەفسانەی كوردی

هەندێك لە زانایان ناوی (میتۆلۆژیا)یان بۆ زانستێكی تایبەتی داناوە كە ئەفسانە دەدوێ، بەڵام میتۆلۆژیا ئەوەیە كە لە ڕێگەی ئەفسانەوە بە دوای باوەڕ و ئاینی كۆن و تازەی گەلاندا دەگەڕێت و بە چاویلكەی ئەدەب ناڕوانێتە ئەفسانە بۆیە زانایان و ڕۆژهەڵات ناسانی وەك مارو نیكیتین و مینورسكی و سینوڤ و فیلچێڤسكی و لاسكۆ، هەروەها نوسەری گەورەی كورد، عەرەب شەمۆ، بگرە (ئەبۆ ڤیان)یش ئەفسانەیان كردوە بە كەرەسەیەك بۆ ساغكردنەوەی هەندێ بیروباوەڕی ئاینی كۆن و تازەی كورد، ئەمانە زۆر لە وێنەی (دێوو درنج و پەری و ڕۆژ و مانگ و بەرد و درەخت و هەندێ جانەوەر، بە تایبەتی لە وێنەی مار، دواون، لە ئەفسانەی كوردیدا[١٢] ئەفسانەی كوردی وێنەی كێشەی نێوان دێوو درنج و ئادەمیزاد دەكات بە نیشانەی ئەو كێشەیەی لە زۆر كۆنەوە لە كۆمەڵێ ئادەمیزادداو و لە نێوان هێزی چاكەو خراپەدا، یا هێزی خێرخواو هێزی خراپەو بەدیدا بەرپا بوە[١٣] بێگومان هێزی چاكە كە زۆربەی ڕەنجدەری كوردە بەرەی ڕووناكییەو قارەمانانی ئەم بەرەیەن كە لە ئەنجامدا، سەردەكەون، هێزی خراپەكاریش دوژمنەكانی گەلن كە بەرەی تاریكین، لە ئەفسانەی كوردیدا هێزی خراپە دێو و درنجە، كە تاریكستان نشینن و بە شەو لە كەلاوەو ژێر چوخم و كوڵانی تەنگدا دەستی خۆیان دەوەشێنن لە ئەفسانەی كوردیدا گەڵێ وێنەی خراپە كار هەن وەكو مار، دێوو درنج، پیرەژەن.. هتد.

نوێنەرانی چاكەش، ئادەمیزاد و پەری و هەندێ پەلەوەرن (ڕوخساری ئەم هێزی خراپەیە لە ئەفسانەی كوردیدا وەك خۆی نەماوە بەڵكو هەندێ شتی ئاینی تازەیشی تێكەڵ كراوە، بۆ نمونە: لە ئەفسانەی كوردیدا دەڵێ: كەاو گیانی بەد –دێوو درنج و خێو– لە مانگی ڕەمەزاندا هەموو لەو دیو كێوی (قاف)ەوە دەبەسترێنەوە، تاوەكو لەو مانگەدا خەڵكی لە خراپەیان ڕزگار بن و ئاسودەو بەختیار دوور لە گیانی بەدیان بژین، كێوی قافیش لێرەدا دیارە كە هەر چیای قەفقاسەكەی ئەفسانەی یۆنانە كە ئەودەمە ئەوپەڕی زەمین بوە لە زانینی گەلدا[١٤] هەروەها وێنەی (مار) لە ئەفسانەی كوردیدا وێنەیەكی تری هێزی خراپەیە، زانایانی (میتۆلۆژیا) ئەمە دەبەستن بە باوەڕی كۆنی ئاینەوە، وا دیارە ئەم وێنە خراپەی مار لە ئەفسانەی كوردیدا هەر ئەو وێنە كۆنەیە كە ئەفسانەی كۆنی یۆنان دەربارەی ئەو مارەی دەگێڕێتەوە كە (ئەهریمەن یان ئیبلیس)ی بردە بەهەشتەوە تا (حەوا) هەڵخەڵەتێنێ[١٥].

ئەفسانەی كوردیش هەروەكو ئەفسانەی نەتەوەكانی تر دەربڕینی هەوڵی مرۆڤە سەبارەت بە ژیانی كۆمەڵایەتی و ڕووداوە سروشتیەكان، ئەفسانەو بە تایبەتی چیرۆك لەناو كوردەواریدا كێشەو خەباتی خەڵك دەنوێنێ بۆ چارەكردنی ئەو كێشانە، لە ئەفسانەو چیرۆكی (سەرگوزشتەی) كوردیدا بە گژاچوونی چینایەتی و زۆرداریی چەوسێنەران و خەباتی چەوساوەكان بە ڕوونی دیارە، كوڕە كەچەڵە كە نمونەی هەژارێكی پڕوزە پێكەوتوە دەچێ بەگژ دێو و درنج و بە گژ پاشایانی زۆرداردا، یان باز هەڵدەدرێ و خۆی دەبێ بە پاشا، لە ئەفسانەی كوردیدا سەركەوتوو هەر ئادەمیزادە، قارەمانی سەركەوتو لە گەڵێ كاتدا لە چەوساوەكانە، ئەگەر بێتو ئەو قارەمانە ژێركەوتووش بێ ژێركەوتنەكە پەند و هاندان و دەرسدادانە بۆ سەركەوتن، لە ئەفسانەی كوردیدا شەڕێكی سەخت بەدی دەكرێ لە نێوان بەرەی ڕوناكی و بەرەی تاریكیدا، هەمیشە بەرەی تاریكی بەرەو كزی و تیاچوون و نەمان دەچێ، بەرەی ڕوناكی كە بەرەی چەوساوەكانە بەرەی ڕەنجبەرانە بەرەو سەربەرزی و سەركەوتن هەنگاو دەنێ.

لە ئەفسانەو چیرۆكی كوردیدا گەڵێ نەریت و بیروباوەڕی كۆنی ئاینی پێش ئیسلام بەدیار دەكەوێ وەكو پیرۆزیی (ئاگر)، بەدیی (مار) كە لەسەر شانی ئەژدەئاكدا بە مێشكی لاوان بەخێودەكران، هەروەها ئاینی ئیسلامیش دوای موسڵمان بوونی كورد بەرە بەرە كاری كردە ئەفسانەی كوردی و نوێنەران یان ئۆبرەزانی چاكەو خراپە.

بۆ نموونە (خدری زیندە) كە كەوتۆتە ناو ئەفسانەو چیرۆكی كوردییەوە وەك نوێنەری چاكەو فریادڕەسی هەژاران و

لێقەوماوان. ".. لە ئەفسانەی کوردیدا وێنەیەکی خێرخوا دەبینین کە (خدری زیندەیە)، ئەفسانەی کوردی ئەم پیاوچاکە لە وێنەی ئادەمیزاددا پیشاندەدات)[١٦] لە ئەفسانەی کوردیدا زیندە ئەو گیانە پاکەیە کە لە شێوەی پیرەمێردێکی ریش سپیدا دەردەکەوێ، ڕووخۆشە، نیشانەکەی ئەوەیە کەوا دەستی زۆر نەرموشلە هەروەك ئێسقانی تیادا نەبێ، تا ڕۆژی کۆتایی ژیانی مرۆڤایەتی، تا ئاسمان و زەوی مابێت ئەو هەر دەمێنێ و فریای ئەو سەرلێشێواو و لێقەوماوانە دەکەوێ کە هاواری بۆ دەبەن، یارمەتیان دەدات، ڕێگەی ڕزگاری و چاکەیان پیشاندەدات.

"ئەم وێنەیەی خێرخوایی بە ناوی (خزر)ەوە لای گەلێك نەتەوەی ڕۆژهەڵات هەیەو هەندێ لە فۆلکلۆر ناسان دەیبەنەوە سەر ئاینەکانی پێش ئیسلام. هەرچەندە زۆر لەوانەش کە تەفسیری قورئانیان کردوە بەو پیاوچاکەی دادەنێن کە لە سورەتی (کەهف)دا باسکراوەو کەوا لەگەڵ حەزرەتی موسادا یەکیان گرتوەو چیرۆکێکی سەیر لە نێوانیاندا ڕوویداوە، کە بە یەکێك لە چیرۆکەکانی قورئانی پیرۆز دەزانرێ ئایەتەکە کە بە بوونی خدری زیندە لێکدەدرێتەوە ئەوەیە کە دەفەرموێ (فوجدا عبداً من عبادنا آتیناه رحمة من عندنا و علمناه من لدنا علماً)[١٧].

نموونەی ئەفسانەی کوردی تەنیا (باڵی و بارام) بەناوبانگە بەڵام گەلێ سەرگوزەشتەی پڕوپوچ لە کوردیدا هەیە کە تا ڕادەیەك لە ئەفسانەش دەچن وەکو سەرگوزشتەی (گورنەتەڵە)، (ڕاوی گردی ڕەش) کە ئەمانە دێوو درنجیان تیایە، بەڵام لە ڕاستیدا جیاوازی لە نێوان ئەفسانەو چیرۆکی پڕوپوچدا بە ڕوونی دیاری ناکرێ چونکە تایژەتی هاوبەش یان چونیەکیان تیایە، کە لە بوارێکی تردا بەراوردێ دەکەین لە نێوان ئەم دوو بابەتە لە ئەدەبی فۆلکلۆری و نزیکی و دوریان لە یەکتری دیاریدەکەین وەك دوو چەشن یان بەش لە بەشەکانی ئەدەبی فۆلکلۆری ئەفسانەی (باڵی و بارام) ئەفسانەیەکی دوور و درێژەو پڕە لە چالاکی مرۆڤ و بەگژاچوونی سەخت لە نێوان بەرەی تاریکی و ڕووناکیدا، ئەم ئەفسانەیە دەکەین بە نموونەو کورتەیەکی دەخەینە پێشچاو.

### باڵی و بارام*.

دوو برا هەبوون یەکێکیان ناوی (باڵی)، ئەوی تریان ناوی (بارام) بوو، لەبەر هەژاری و بێ دەرامەتی سەری خۆیان هەڵگرت و کەوتنە وڵاتان، تا گەیشتنە شارێك، سەیریان کرد ئەم شارە هەمووی بەرگی ڕەشی ماتەمیان پۆشیوەو کزو مەلولن، کە پرسییان بۆیان دەرکەوت کە پاشا مردوەو کەسیشی لەپاش بەجێ نەماوە. لە زۆر کۆنەوە لەم شارەدا، لە باری ئاوادا نەریتیان وابوە کە باز هەڵدرێ، سا، باز بەسەر کێوە نیشتەوە، ئەوە بکەن بە پاشا، ئەم باز هەڵدانەش دوای چلە چوونی پاشای مردوو دەکرێ. باڵی و بارام لەم شارەدا مانەوە تا ڕۆژی بازهەڵدان، لەم ڕۆژەدا کە شار خرۆشاوە سوارێکی ڕەشپۆش هات، تا ئانیشکی دەستکێشێکی چەرم لە دەستیدا بوو، ئەو دەستەی وەکو دار، ڕەپ ڕاگرتبوو، بازێکی بە سەرەوە بوو، سوارەکە لەناو خەڵکەکەدا وەستاو وتی: (ئەی بازی جوانی خۆش پەرواز، باووباپیرانت هەر لەم شوێنەدا هەڵفڕین و نیشتوونەتەوە بەسەر کارزانانەوەو بوون بە پاشا وا نۆرەش گەیشتۆتە سەر تۆ هەڵبفڕە پاشایەك بدۆزرەوە بۆ ئەم شارە). کە بازەوان ئەمەی وت و دەستی جوڵان، باز دوای چاوگێڕانێك هەڵفڕی و بەسەر سەری خەڵکەکەوە دەستی کرد بە سوڕانەوە، گەڕا گەڕا تا بەسەر سەری باڵییەوە نیشتەوەو وەك سنگ چەقی، باڵی کرا بە پاشاو چوە سەر تەخت و بارامیش لە سایەی ئەودا کەوتە نازو نیعمەتەوە.

ماوەیەکی زۆر بەسەر پاشایەتی (باڵی)دا تێپەڕی بەبێ ئەوەی خوا منداڵێکی بداتێ، تا دوای خۆی شوێنی بگرێتەوە، باڵی شاش بەرە بەرە هەنگاوی دەنا بەرەو مەرگ ڕۆژێ لە ڕۆژان دەروێشێك ڕوی کردە دەرباری شاو تەورزینێکی بەدەستەوە بوو، کەشکۆڵێ لە شانیاو، تەزبیحێکی دەنك گەورەی کردبوە ملی، ڕوی کردە کارەکەرو کەنیزەکان و وتی: تا شاژن نەبینم ناگەڕێمەوە، شاژنیش کە ئەمەی گوێ لێبوو لە تەلارەکەوە خۆی بانگی کرد، شاژن وتی: فەرموو، ها دەروێش دەڵێی چی؟.. دەروێش وتی: پاشای ئەم شارە ئەم هەموو دەسەڵات و سامانەی هەیەو منداڵێکی نییە کە دوای خۆی لە شوێنی دانیشێ، لەبەرئەوە ئەم سێوەت دەدەمێ بیکە بە دوو لەتەوە، خۆت لەتێکی بخۆ لەتەکەی تریشی بدە بە مێردە دادپەروەرەکەت بیخوات، ئومێد دەکەم خوا منداڵێکتان پێ ببەخشێ، دوای خواردنی سێوەو بەسەرچونی نۆ مانگەو نۆ ڕۆژە شاژن کوڕێکی بوو، ناویان نا (شاروخ) و کاتێ کە شاروخ تەمەنی گەیشتە (٥) ساڵان ژنەکەی بارامیش کچێکی بوو ناویان نا (گوڵ ڕوخ)، کە باڵی پاشا مرد لەبەرئەوەی شارۆخ تەمەنی نەگەیشتبوە ڕێزەی شاهێتی بارامی مامی کرا بە چاودێریکەری کاروبار تا (شاروخ) دەخرێتە سەر تەخت، شاروخ و گوڵ ڕوخ دڵیان بە یەکدا چوو بوو، لەبەرئەوە شاروخ کە داوای گوڵ ڕوخی کرد مامی کەوتە برو بەهانە گرتن، بە جۆرێ شارۆخی وەڕس کرد لە داخا ماڵ و موڵکی بەجێ هێشت و سەری خۆی هەڵگرت، ڕۆشت، تا سەری لە بیابانێکی کاکی بەکاکیدا دەرهێنا، تەماشای کرد لە دوورەوە کۆشکێ دیارە چوو بۆ لای ئەو کۆشکە، سەیری کرد ئەم کۆشکە گەورەیە بێ دەرگایە، شەش جار بە دەوریا گەڕا دەرگای بەدی نەکرد تا سەری حەوتەم جار دەرگایەکی بچوکی بەرچاوکەوت، چوە بەر دەرگاکە خەریکبوو دەستی پێوەنێ لەپڕ بەرگوێی کەوت وتی: (لە دەورت گەڕێم شاروخ ڕزگارم کە) تەماشای کرد دەلاقەیەکی دی و پیرێژنێ توند تیایدا شەتەك دراوە زۆر بەزەیی پێدا هاتەوە، چوو ڕزگاری بکات بەڵام لەپڕ دەنگێکی تری بیست وتی: شاروخ نەکەی بەرەڵای

بكەی، ئەگەر بیتو رزگاری بكەیت جاریكی تر چاوت بە خۆت ناكەویتەوە. بەلاّم شاروخ گویی نەدایە دەنگەكەو چوو بەلای پیریژنەكەوە ئەم جارەش هەر ئەو دەنگە هاتەوە بەرگویی، ئەمیش ئەوەندە شلەژا شیرەكەی داوەشان دای لە ملی پیریژنەكەو پەراندی. پیریژنە زریكەیەكی كرد و تەم و مژێ پەیدابوو، لە پاش تاوێ كە سەیری كرد هیچی نەدی نەختێ خوینی رژاو نەبێ، ئەمجا دەرگا كرایەوەو چوە ناو كۆشكەكەوە، سەیری كرد ئەم كۆشكە كەسی تیانییە، بەلاّم كتوپر ریوییەك كردی بە ژووردا، ریویەكە وتی: كەس نەیتوانیوە تەلیسمی ئەم شوینە بشكینێ بیتە ئەم كۆشكەوە وا تۆ توانیت بەخیربییت. دوای چەند رۆژی مانەوە لەو كۆشكەدا رۆژێ ریوی لیی پرسی بۆ وا ماتی، ئەویش بەسەرهاتی خۆی بۆ گیرایەوە، ریویش وتی (ئاسانە)، بۆ بەیانی ریوی هەموو درندەو پەلەوەری ئەو ناوەی بانگكرد بۆ نانخواردن، ئەمجا دوای نانخواردن پیی وتن شاروخ كە ئیوە ئەمشەو نمەكتان كرد ئیشیكی پیتانەو ئەو ئیشەش ئەوەیە كە بچن بۆ شاری (بارام پاشاو) دەستگیرانەكەی بۆ بینن، شیرو پلنگ لە پیشەوەو هەزاران درندە لە دوایانەوەو هەزاران پەلەوەر بە ئاسمانەوە (بۆ بەیانی) رویانكردە شار.

لەوكاتەدا گول روخ لە تەلارەكەدا بوو، كە شار لە ترسی هیرشی ئەم درندانە شلەژابوون، سیمورخ خۆی گەیاندە گول روخ و فراندی و هینای بۆ لای شاروخ. بەلاّم دوای ماوەیەك باوكی گول روخ كە ئارامی لی هەلگیرابوو لەتاو كچەكەی و نائومید ببوو لە جادوگەران، رۆژێ پیریژنیكی لی پەیدا بوو، پیی وت: چیم خەلاّت دەكەیت ئەگەر گول روخت بۆ بینمەوە پاشا وتی (بە كیشانەی خۆت ئالتوون) پیریژنە وتی: نەء، (بە كیشانەی خۆم پەتك). پیریژنە سواری چەرخ و فەلەكەكەی بوو، بەرزبۆوە تا لەچاو ونبوو، ئەمجا لەو بەرزییەوە چاوی گیرا تا كۆشكەكەی دۆزییەوەو لەناو كۆشكەدا نیشتەوە چەرخ و فەلەكەكەی بە گژوگیا داپۆشی، چوە لای گول روخ، گول روخیش زۆر دلی بەم هاودەنگە كرایەوە، كە شاروخ لە راوو شكار هاتەوە بوونی ئەم پیریژنەی پێ ناخۆشبوو، زۆر هەولی دا كە گول روخ دەربیكات بەلاّم بێ سوود بوو، پیریژنە مایەوە تا رۆژیكیان لەناكاو گول روخی فراند، پیی وت لەمە خەرەكە تۆ بچۆرە ناوی، ئیستە فیرت دەكەم چۆن ئیشی پێ دەكەیت، بەم بیانوەوە خستیە ناو چەرخ و فەلەكەكەو فراندی، بەلاّم ئەمجارەش ریوی فریای شاروخ كەوتەوەو بە هۆی سیمورخ و درندانەوە گول روخی بۆ هینایەوە. بەلاّم بارام شا كە بە هۆی پیریژنەكەوە شوینی كۆشكەكە شارەزابوو، لەشكریكی گەورەی بردوو گەمارۆی كۆشكەكەیاندا.

دیسان ریوی فریای شاروخ كەوتەوەو پیلانیكی تری بۆ دانا پیلانەكەش ئەوە بوو، كە هەرچی جروجانەوەر هەیە، وەك كوللەو مشك و كرم و میروولەو سیسرك و قالۆنچە هەموو لەو ولاّتەدا كۆی كردنەوەو شەو بەری دانە لەشكری پاشا، تا وای لیهات لەشكر پەریشان بوو، جلیان بە بەرەوە نەهیشتن ناچار پاشا خۆی دا بە دەستەوەو ئاشتبۆوەو گول روخ و شا روخ بە یەك شاد بوونەوە، ئەمجا بیینەوە سەر مام ریوی، مام ریویش لەگەلیاندا چوە كۆشكی پاشاوەو لە سایەی شاروخ شادا كە لەسەر تەختەكەی خۆی دانرا، وە لە سایەی شا بانودا (گول روخ) ئەژیا، تا رۆژێ لە رۆژان كەنیزەیەكی هاوار دەكات و دەلیت: ریوییەكە مرد گول روخیش دەلێ: چیبكەم كلكی بگرن و فریی بدەنە سەرەنویلكەكە. لەم كاتەدا مام ریوی كە تومەس خۆی لە بووسە داوە، هەل ئەبلوقیتەوەو دەلێ: ئای ئادەمیزاد ئەمەبوو پاداشتی ئەو هەموو چاكەیەی لەگەلمدا كردن؟! لەم كاتەدا شاروخ هاتەوەو بەمەی زانی زۆر لە ریویەكە پارایەوەو تكای لیبوردنی لیكرد بەلاّم بیسود بوو، ریویەكە وتی (من ریوی نیم كچی شا بالشای پەرییانم، كەوتبوومە ئەو تەلیسمەوە كە تۆ شكاندت و رزگارت كردم بۆیە منیش ئەوەندە چاكەم دایتەوە، ئیتر من دەرۆمەوە) ریوی كە ئەمەی وت لەپر بوو بە كۆتریك و دای لە شەقەی بالّ.

**سەرگوروشتە**

چیرۆك یان سەرگوروشتە (سەرگوزەشتە)، یان حیكایەت بەشیكی گەورەو فراوانی ئەدەبی فۆلكلۆری كوردییە. گەلیك بابەت لە چیرۆكدا هەیە، بەلاّم دەتوانرێ بە گشتی بە دوو چەشن دابنرێ:

١-چیرۆكی پروپووچ.

٢-چەشنە چیرۆكەكانی تر كە دوورن لە پروپووچەوە.

سابارەت بە چیرۆكی پروپووچ شیرازەیەك لە نیوان ئەو ئەفسانەدا هەیە كە زۆر توندو تۆلە چونكە لە هەردوكیاندا خەیالّ و (پروپووچ) رۆلی ئاشكرای خۆیان هەیە بەلاّم جیاوازی لە نیوانیاندا ئەوەیە كەوا ئەگەرچی هەردوكیان یەك ئامانجیان هەیە كە ئەوەیش ریكخستنی ژیانە بەلاّم ئەفسانە هەولیكە بۆ تیگەیشتن لە گەردوون و دیاردەكانی، كەچی چیرۆك پەیوەندیی بە كۆمەلگای مرۆڤایەتییەوە پترە، دوورە لەو لیكدانەوەیەی كە دەدرێ بۆ دۆزینەوەی پەنهانیەكانی گەردوون.

چیرۆك (بە هەموو بەشەكانییەوە) كورتترە لە ئەفسانەوە ئەگەرچی وەك ئەفسانە لە هەندیكیدا (گیانی نادیار و خەیالی ئالۆزكاویشی تیایە) بەلاّم لەوەدا لە ئەفسانە جیادەكریتەوە كە خواوەندەكانی تیانییە، چونكە چیرۆك تازەترە لە ئەفسانە.

"چیرۆك بەرەو پیشچوونیكی میژوویی ئەفسانەیەو لە رووی فۆرم و دارشتنەوە لەو دەچیت، هەرچەندە لە رووی كەرەسەو ناوەرۆكەوە هەندێ جیاوازییان هەیە"[18]. هەروەها چیرۆك لە سیفەتیكدا لەگەلّ ئەفسانەدا هاوبەشن كە ئەویش ئەوەیە هەردوكیان پشتاوپشت و دەماودەم بلاّودەبنەوەو دەژین.

لە لایەكی ترەوە دەبینین كەوا ئەفسانە لە چیرۆك جیاوازە چونكە "كەرەسەی ئەفسانە لە خەیاڵ و پڕوپوچەوە وەرگیراوە، بەڵام كەرەسەی چیرۆك لە ژیانەوە وەردەگیرێ[19]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئەوەمان لەبیرنەچێ كەوا ئەو خەیاڵ و پڕوپوچەش كە لە ئەفسانەدا هەیە هەر لە ژیانەوە وەرگیراوە، چونكە جۆری لێكدانەوەی مرۆڤی سەرەتاییە كە هیچی دەربارەی پەنهانیەكانی گەردون نەزانیوە. تەنانەت هیچ دیاردەیەكی سروشتیش ئەمە لە لایەك، لە لایەكی تریشەوە، چیرۆك هەیە كە پڕوپوچ ئامێزە، لەبەرئەوە دەشێ بوترێ كەوا جیاوازی لە نێوان ئەفسانەو چیرۆكدا (بە گشتی) ئەوەیە كە ئەفسانە لە بەرگی خەیاڵدایەو گەلێ چیرۆك بەو چەشنە نین، تەنانەت چیرۆكی پڕوپوچیش یەكجار وانییە.

یەكەم شت كە لە چیرۆكی پڕوپوچدا سەرنجڕادەكێشێ ڕێڕەوە ڕەوشتیەكەیەتی كە دەیەوێ پاداشتی چاكە بە چاكە بداتەوەو هی خراپە بە خراپە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ چیرۆكدا هەندێ كەس دەبینین كە لەوە ناچی هەوڵی چاكە بدەن، یان هەست بەوە ناكەین زۆرداریەك ڕووی كردبێتە ئەو كەسە، وەكو ئەو كچە شازادەیەی كە (١٠٠) ساڵ خەوی لێكەوت، ئەمجا كوڕە شازادەیەك هات بە ئاگای هێناو خواستی، لێرەدا ئەوە نابینین كە ئەم دوانە چاكەیەكیان كردبێ و ئەوە هەڵبگرن كە پاداشتیان بدرێتەوە، هەروەها ناڕەواییەك بەرامبەریان نەكراوە تا دادپەروەری لە سەریان هەڵبداتێ و خۆی لەو چیرۆكەدا بنوێنێ، كەواتە چییە؟ ئەمە سیفەتێكی تری چیرۆكی پڕوپوچمان بۆ دەردەخات كە ئەویش ئەوەیە كەوا ئادەمیزاد حەز لە شتی سەیرو جادووگەری دەكات[20].

چیرۆكی پڕوپوچ كاروباری ژیان بەو جۆرە دەخاتە ڕوو كە پێویستە وابێت (واتە كە دەیەوێ بەو چەشنە بێت) نەك بە جۆرێ بیخاتەڕوو، كە وەكو هەیە، بۆ نمونە لە چیرۆكێكدا، ئاشەوانێ ئەمرێ و سێ كوڕی دەبێ، ئەوانیش میراتەكەی بەش دەكەن، كوڕە گەورە ئاشەكەو ناوەنجیەكەرەكەو بچووكەكەش پشیلەكەی بەر دەكەوێ، بێگومان پشیلەكە هیچ سودێكی نییە، كەواتە برا بچوك بێبەش بوو، زۆری لێكرا، لێرەدا بەشخوراویی بێ دەسەڵاتان پێشان دەدات زۆرداریی دەستڕۆشتوان دەردەخات، بەڵام چیرۆكەكە لێرەدا تەواو نابێ چونكە ئەگەر لێرەدا تەواوبێ ئەوا تەنیا ڕووداوەكەی تۆماركرد وەكو خۆی نەك وەكو خۆی دەیەوێ لە كۆتاییدا دەردەكەوێ كەوا ئەم پشیلەیە دەبێ بە هۆی ئەوەی كە برا بچوك ژیانێكی بۆ دەلوێ كە لە هی ئەوان خۆشتر بوە[21].

جیهانی چیرۆكی پڕوپوچ ڕوبەڕوی جیهانی ڕوداو دەوەستێتەوەو ئەو جیهانە بەرپەرچ دەداتەوەو لەجێی ئەو جیهان و ژیانە جیهانیكی جوانتر بنیات دەنێ بەم پێیە دەتوانین بلێین كەوا جادوگەری لە چیرۆكی پڕوپوچدا بۆ دەرخستنی قارەمانیتی قارەمان نییە وەكو (ئەفسانە) بەلكو تاكە پشتگیری كردنی ئەو چەشنە قارەمانەیە كە ژیانی واقیعی ئیمە لای بردوە، واتە لە واقعدا قارەمانی لەو چەشنە نییە، بەڵام بە هۆی ئەو جادوگەرییەوە چیرۆكەكە دروستی دەكات بەم جۆرە چیرۆكی پڕوپوچ لە شوین و ڕۆژگار خۆی دوردەخاتەوە، كە ئەم دوانە (شوین و ڕۆژگار) لە پیویستییەكانی جیهانی واقیعی ئیمەن.

هەروەها كەسانی ئەم چەشنە چیرۆكانە، یاخود بلیین (قارەمانانی)، سا، مرۆڤ بن یاخود گیانلەبەران بەو شیوەیە، لە جیهانی ئیمەدا ناژین چونكە ئەم كەسانە نمونەی لیكدانەوەو، وینە ریژیی ئادەمیزادانی سەرەتان نەك هی ئەم سەردەمانە[22].

لەگەڵ ئەوەشدا چیرۆكی پڕوپوچ خۆی لە خۆیدا هەولدانیكە بۆ گۆڕینی باری ناهەمواری ژیان واتە ئەو ئاواتانەی كە مرۆڤ دەیەوێ بیگاتێ لە دادپەروەری و ئاسودەیی و یەكسانیو.. هتد لە چوارچیوەی خەیالدا دەریدەبریت كەواتە هەرچەندە چیرۆكی پڕوپوچ ناوی خۆی بە خۆیەوەیەتی و پاراوو بگرە گۆشی پڕوپوچە بەڵام ئەو شیوازە بەكارهاتوە لە پیناوی ژیانی واقیعی ئادەمیزادا، لە پیناوی بە ئاوات و ئامانج گەیشتنی گەلدا، واتە ".. لەو پلەیەی میژووی گەلدا كە ئەو چیرۆكانەی تیادا هاتۆتە كایەوە كە لە ژیانی راستەقینەدا توانای هینانەدیی ئەو شتانە نەبوە، ئەوا ئادەمیزاد بە بالی خەیال بەرەو ئەو ئاواتە رۆیشتوە[23].

هەندێ چیرۆك هەن كە بە دەم ئاژەل و گیانلەبەر و بالندەوە هەلبەستراون، وا دیارە ئەو سەردەمانە لیكدانەوەی زانستی دوور بوە لە جیهانی ئەو چەشنە گیانلەبەرانە، لەبەرئەوە (شتێكی دەگمەن نیە كە چیرۆك بێژی كورد سەرگوزەشتەی یەكێك دەگێڕێتەوە بلێت: زمانی هەموو گیانلەبەرێكی دەزانی، كەواتە تا ئەو كاتە ئادەمیزاد وای زانیوە كە گیانلەبەری تر زمانی تایبەتی خۆی هەیە)[24] (ئەمە ڕوویەك، ڕووەكەی تر ئەوەیە كە ئەم جانەوەر و ئاژەڵ و باڵندەیە تەنیا نیشانە بن و لەودیو پەردەوە بەناوی ئەمانەوە ژیانی ڕاستەقینەی كۆمەڵ و ئادەمیزاد بخرێتەڕوو. ئەم جۆرە چیرۆكانە لە ئەدەبیاتی زۆربەی گەلاندا هەن، چ لە ئەدەبیاتی نوسراوداو چ لە فۆلكلۆردا. (كلیلەو دیمنە) كە بە میراتێك دەژمێردرێ بۆ هەموو گەلانی ڕۆژهەلات نموونەی بەرزی ئەم وێژەیەیە[25]، ئەم چیرۆكانە ئەمڕۆش لە ئەدەبیاتی جیهاندا تەنانەت لە ئەدەبیاتی ڕیالیزمی (واقیعی)شدا دەبینرێن، ئەم چیرۆكانە لە بەرگی ئەمڕۆیاندا پەرەپێدانێكی وێنەی جانەوەر و ئاژەڵ و باڵندەكەی ئەدەبی فۆلكلۆری گەلە[26]. بۆ نموونە لەسەر چیرۆكی گیانلەبەران ئەم كورتە چیرۆكەی خوارەوە پێشكەش دەكەین: ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕێویەك لە بێشەیەكدا برسێتی پەرێشانی دەكات ئەویش بە ڕێكەوت دوو بێچوە شێر دەبینێ یەكێكیان دەخوات، دیسان بۆ ڕۆژی دواییش دەچێتەوە هەمان شوێن و

بێچووەکەی تریش دەخوات، ڕۆژێکیان شێرە ڕێویەکە دەبینێ و پێی دەڵێ: نازانی کێ ئەم جووتە بێچووەی منی خواردوە، مام ڕێوی دەڵێ: بەڵی قوربان، مام ورچ خواردونی، شێرەکە دەڵێ: دە بچۆ مام ورچم بۆ بانگ بکە بەڵام زوو، ڕێویەکەش دەچێ بە مام ورچ دەڵێ: پاشای بێشەکەمان (شێر) دەیەوێ کوێخایەك دابنێ، ئەمجا لە تۆ لێهاتووترمان تێدا نییە لەبەرئەوە هەموومان تۆمان هەڵبژاردوە، ورچەکەش ئەمەی زۆر پێ خۆش دەبێ ڕێویەکە دەڵێ: بەڵام خۆت دەزانیت کەوا شێر گیانلەبەری ئازای خۆش دەوێ، لەبەرئەوە تۆیەکی ژیرو سەنگین دەبێ ئازایەتی خۆشتی بۆ دەربخەیت، ئەمجا ئەزانی چی بکە؟ شێرەکە چی لێ پرسیت مەترسەو بڵێ بەڵێ، کە ورچەکە دەچێتە لای شێرەکە، شێرە لێی دەپرسێ: ئەرێ مام ورچ سێ ڕۆژ لەمەوبەر تۆ بووی بێچوویەکی منت خوارد؟ ورچەکە ئەڵی (بەڵێ) شێرەکە دیسان دەڵێ: ئەی ڕۆژێ دوای ئەوە هەر تۆ بووی کە بێچووەکەی ترمت خوارد؟ ورچەکە دەڵێ: بەڵێ.. شێرەکە لەپڕ چنگ لە پشت ملی ورچەکە گیردەکات و کەوڵی دەکەنێ، ورچە بەلارەو لارەوە دەڕوات و مام ڕێوی پێی دەڵێ: مەڕۆ مەڕۆ، کوێخای توکاوا عەباکەت بەجێماوە[٢٧].

(چیرۆکی کوردی تەواو بە ژیانی گەلەوە لکاوە، لە ژیاندا هەوڵدان، لە هەوڵدانا کۆڵنەدان، لە کاردا بەردەوامی و ساردی نەزانین لە ئەڤین و دڵداریدا وەفاداری، لە مەبەسدا سووربوون لەسەر گەیشتنە ئامانج. ئەمانە سروشتی مێژووی نەتەوەی ئێمەن و بە سادەییەکەی خۆیان ڕێگەیان بەرەو ئەو بەرهەمە ڕەنگینەی گەل گرتۆتە بەر کە چیرۆکی پێدەڵێن[٢٨] (ئەم چیرۆکە کوردیانە هەر بەرهەمی خەیاڵ نین.. بەڵکو زۆر جار چیرۆك ڕوداوی مێژوویی دەگێڕێتەوە یان ژیانی ڕاستەقینەی کەسێك یا قارەمانێك یا فەرمانڕەوایەك دەگێڕێتەوە کە لە مێژوودا ناسراوبێت، پێویستیش نییە، بەڵکو ناشێ کە کتومت سەرگوزەشتەکە چۆن ڕوویداوە هەروەها بگێڕرێتەوە، بەڵکو خەیاڵی چیرۆك بێژو سەرگوزشتە گێڕەرەوەکەو ئەو کەسانەی دوای ئەو (پشتاوپشت) دەیگێڕنەوە شتی تازەی دەخەنە سەرو خەیاڵی تێکەڵ دەکەن. بە کورتی دیمەنێکی خەیاڵ و لێفراوان کردنێکی میللەتیشی تیایە، بۆیە دەبینین ڕوداوێکی مێژوویی، یا سەرگوزەشتەی کەسێك، زۆر زل دەکرێت، گەلێك کردەوەی بە ئەقڵدا نەچوو دەدرێتە پاڵ قارەمانی چیرۆکەکە. سەرگوزەشتەی قارەمانێتی کوردی زۆر لە چیرۆك زیاتر شەقڵی تایبەتی نەتەوەی کوردی پێوەیە، نمونەی بەرزی نوسینەوەو پوختەکردنەوەی ئەم سەرگوزەشتانە (دوانزە سوارەی مەریوان) (مەحمود ئاغای شێوەکەڵ) و (شەریف هەمەوەندی)[٢٩] پیرەمێردن، کە وێنەی فۆلکلۆرو ناو خەڵکی ئەم سەرگوزەشتانەی هێناوەو خامەی هونەریی خۆی بۆ خستۆتە کار. ئەو چەند وشەیەی پیرەمێرد -کە لە ساڵی ١٩٣٥ دا کردبوونی بە سەرەتای (دوانزە سوارەی مەریوان) باشترین قسەن بۆ ئەوساو ئێستای چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی. پیرەمێرد نوسیویە: (مناڵ بووم هەرچەندە بەیتی دوانزە سوارەیان بۆ دەکردم، بەو منداڵیە خۆم بە پاڵەوانێك دەزانی) کورگەل فیدای هەڵمەتی شێرانەتان بم ڕۆژێکەو ئەمڕۆ ڕووی خاکەکەتان سپی کەن منیش بە خەیاڵ خوم دەدایە، ئێجگار کە دەیانخوێندەوە: جوامێر ئاغای ڕەنگینە پڵنگی چنگ بەخوێنە، من ئەوەندەی تر شەیدای دەبووم، ئینجا زۆر ئاواتە خوازبووم کە بۆم هەڵکەوێ ئەم دوانزە سوارەیە بنوسمەوە بەڵام هیچ بەڵگەو بناغەیەکم دەست نەکەوت، منیش ڕاست و ڕەوان، باوکم چۆن لە باپیرمی بیستوەو منیش چۆن لە باوکم بیستوە وا نوسیمەوە، ئەمەش ڕاستیەکەیەتی.

ئۆف شاعیرەکانی پێشین[٣٠].

***سەرچاوە:*** ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردی -بەشی یەکەم- کامەران موکری -چاپ: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، ساڵی ١٩٨٤، لاپەرە (٣٩-٥٧).

**پەراویزەکان:**

١-اشـكال التعبير في الادب الشعب- الدكتوره نبيله ابراهيم- منشورات مكتبة النهضة المصرية ص (٩ و ١٠ و ١١).
٢-سەرچاوەی پیشوو ل (١٠ و ١١).
٣-سەرچاوەی پیشوو ل (١٠و ١١).
٤-سەرچاوەی پیشوو ل (١٦).
٥-سەرچاوەی پیشوو ل (١٦٦).
٦-سەرچاوەی پیشوو ل (١٧).
٧-سەرچاوەی پیشوو ل (٢١ و ٢٢).
٨-سەرچاوەی پیشوو ل (٢١ و ٢٢).
٩-سەرچاوەی پیشوو ل (٢٢).
١٠-سەرچاوەی پیشوو ل (٢٣).
١١-سەرچاوەی پیشوو ل (٢٤ تا ٣١).
١٢-ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی- دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسول، بەغداد ١٩٧٠ ل (١١).
١٣-سەرچاوەی پیشوو ل (١٣).
١٤-سەرچاوەی پیشوو ل (١٤).
١٥-سەرچاوەی پیشوو ل (١٤).
١٦-سەرچاوەی پیشوو ل (١٦).
١٧-سەرچاوەی پیشوو ل (١٧).
١٨-سەرچاوەی پیشوو ل (١٨).
١٩-سەرچاوەی پیشوو ل (١٨).
٢٠-اشكال التعبير.. ص (٦٠ و ٦١).
٢١-سەرچاوەی پیشوو ل (٦١).
٢٢-سەرچاوەی پیشوو ل ( ل (٦٢).
٢٣-ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی.. (ل (١٩).
٢٤-سەرچاوەی پیشوو (ل (٢٠).
٢٥-سەرچاوەی پیشوو ل (٢٠).
٢٦-سەرچاوەی پیشوو ل (٢١).
٢٧-بیستن.
٢٨-ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی.. (ل٢٢).
٢٩-سەرچاوەی پیشو ل(٢٣).
٣٠-سەرچاوەی پیشو ل (٢٣ و ٢٢).

وتار

# ئافرەت و سەربەستی

**کامەران موکری**

ئێمە ئەڵێین ئافرەت نیوەی کۆمەڵە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زەبوونی و زۆرلێکراوی بە درێژایی سەدەهای سەدە ئەگەر بتوانین کۆیبکەینەوەو بیکەین بە پەیکەرێ، ئافرەتێکی لێ دەردەچێ، چونکە ئافرەت لە سەردەمی پەیدابوونی شەڕەوە هەر زۆرلێکراوەو زۆرلێکراوتر بوە لە پیاوی زۆرلێکراو، ئافرەت زۆر لێکراو و زەبونە، ئەو پیاوە کرێکارەی کە بە دەست خاوەن کارگەو سەرمایەدارەوە دەچەوسێتەوەو گیردەخوات ژنەکەی بەدەست ئەمیش و ئەویشەوە گیرۆدەیە، یان جوتیار کە دەبێ بەژێرباری گرانی چەوسانەوەی خاوەن زەوی و زارەوە ژنەکەی چەوساوەی دەستی ئەمیش و ئەویشە، واتە ئافرەت دیلی دیلە..

**پەندی پێشینانی کورد ئەڵێ:**

شێر لە بێشە هاتەدەر چ نێربێ و چ مێ

کەواتە ئەی بۆچی ئافرەت ژێردەستە؟ بێگومان ئەم پەندە دان بەوەدا دەنێت کە ئافرەت و پیاو جیاوازی لە نێوانیاندا نیە لە رووی تواناوە، بەڵام ئەم پەندە لە دەمی یەکێکەوە هاتۆتەدەرێ ئەگینا هەستی گشت دەرنابڕێ، لەگەڵ ئەوەشدا بە پێی ئەم پەندە، ئەگەر بێتو رێ لە ئافرەت نەگیرێ لە هەموو لایەنێکی ژیاندا دەتوانێ شان بە شانی پیاو هەنگاوبنێ و ئەم پەندە بێنێتە دی.

بەڵام پیاو رێی نەداوە بە ئافرەت بێتە چەقی رێی ژیانەوە تا بسەلمێنێ لەو کەمتر نیەو لەو بێتواناتر نیە. سەردەمێ بوو لە شوێنێکی وەکو شاری سلێمانیدا کچ ناردنە قوتابخانە زۆر شورەیی بوو، ئەمجا کە ئەو رێیەی لێگیرا چۆن بزانرێ کە ئایا توانای خوێندنی وەك کوڕ هەیە یا نا؟ بێگومان کە دەرفەت و بوار وەك یەك بوو بۆ پیاوو ئافرەت ئەوسا دەردەکەوێ کە ئافرەتیش هەروەك پیاو خاوەن بەهرەیەو توانا. بەڵام ژیانی ئابوری کە کاردەکاتە سەر ژیانی کۆمەڵایەتی ئەوە بوە بە هۆی ژێردەستی ئافرەت.

لە دێر رۆژگارانی پێش مێژوودا کاتێ کە پیاو راوی دەکرد لە پێناوی ژیاندا، ئافرەتیش خەریکی بەخێوکردنی منداڵەکانی دەبوو، هەروەها پاراستنیان لە درندەو سەرماو سۆڵەو گەرماو زەبری سروشت، هەروەها ئاژەڵی ماڵی دەکردو گژوگیاو میوەی کۆدەکردەوە بۆ خواردن. لەم سەردەمەدا ئەم کارە گرنگانە پایەیەکی بەرزی بە ئافرەت بەخشیبوو، کە بەرزتر بوو لە پایەی پیاو، چونکە ئەو بوو پارێزەری وەچەی ئادەمیزاد، بەم پێیە ئافرەت لەم سەردەمەدا کە سەردەمی دایکێتی بوو نرخێکی گەورەی هەبوو بەڵام کە کانزای مس و ئاسن و زەرد دۆزرایەوەو چەك و ئامێری سادەی کانزایی دروستکرا و جەنگ لە دایك بوو، جەنگ بوو بە سەرچاوەی دەستکەوت و نان پەیداکردن، پیاو زاڵ بوو بەسەر ئافرەتدا، چونکە پیاو شەڕی دەکرد، ئافرەت لەبەر منداڵبەری بە دەگمەن نەبێ ئەو کارەی پێ نەدەکرا بەم جۆرە ژن بوو بە ژنی ماڵ، ئەمجا کە ئادەمیزاد بوو بە خاوەنی موڵك و پیاو بە تەواوی دەستی بەسەر ئافرەتدا گرت و بوو بە میراتدەر.. ژن هێنان و بەرەڵاکردنی و ژن بەسەر ژن هێنان کەوتە دەست پیاو -بەم جۆرە کە پیاو بوو بە خاوەنی هۆی بەرهەمهێنان ژنیش بوو بە نان خۆرو ژێردەستەی ئەو، کەواتە کەی ئافرەت هاوبەش بوو بە یەکسانی لە بەرێوەبردنی ژیانی ئابوری کۆمەڵێکدا، هاوبەشی هۆی بەرهەمهێنان بوو دەگات بە سەربەستی.

بەپێی لێکۆڵینەوەی گەلێ لە شارەزایان سەربەستی ئافرەت بەستراوە بە جۆری رژێمی ئابوری ئەو وڵاتەوە، گوایە هەنگاونان بەرەو سۆشیالیستی هەنگاونانە بۆ رزگاری ئافرەتیش، بەڵام ئەبێ ئافرەت خۆشی بەشداربێت لەو تێکۆشانەدا بۆ چەسپاندنی ئەو جۆرە رژێمە..

ئافرەت دەبێ لە سەربەستی بگات و بشزانێ چۆن بەکاری دەهێنیت، پیاویش هەر بەم چەشنە دەبێ لە سەربەستی ئافرەت بگات و هەردوو لاش هاوبەشی بکەن لە خەباتی رامیاری و کۆمەڵایەتیدا.

پیاوو ئافرەتیش هەردوولا دەبێ لە لیستەی نەریتە کۆنەپەرستیەکان پاك بکەنەوە، ئەگینا نە بەدەم ئەو سەربەستیە سەردەگرێ و نە یاساش بە بێ رێ پاك کردنەوە و هەولدان بە شێوەیەکی سروشتی دەگاتە ئەنجام.

پیاوان لە فەرەنسە ئەگەرچی باستیلیان رمان، بەڵام ژنان هەموو وڵاتیان داگیرکرد، ئیستەش لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەتی فەرەنسی سەربەست نیە، مەگەر هەر ئەو بەرتیلەی بدریتێ کە لە پێش پیاوەوە بڕۆن و

دەستیان ماچ بکرێ، کە ئەمە سەربەستی نیە، بەڵکو نیشانەی ئەوەیە کە ئافرەت بە سەرچاوەی تام و بە چەپکە گوڵ و جامی مەی دانراوەو هیچی تر.

کەواتە ئافرەت لە شوێنێکی وەکو فەرەنسەدا ئەگەرچی هەروەك پیاو بەشداری شۆڕشی کرد، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا نەگەیشت بە سەربەستی چونکە ڕژێمی ئابوری فەرەنسی بەو جۆرەیە کە بواری تەواو بۆ ئافرەت پەیدا نەبوە کە سەربەستی خۆی لێوە بەکاربهێنێ.

یاساو ڕژێم ئەگەرچی کارێکی بنەڕەتی دەکات لە رووی سەربەستی ئافرەتەوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ مێشکی پیاویش و ئافرەتیش زاخاو بدرێتەوەو لەو ژەنگی نەریتانە ڕزگاربکرێ کە هی هەزاران ساڵە.

بە داخەوە زۆربەی پیاوان گۆشی شیری قێزن سەبارەت بە سەربەستی ئافرەت، بەلای منەوە زۆربەمان ئەگەر نەڵێم هەموومان دووڕوویین بەرامبەر بە سەربەستی ئافرەت، وە ئەو سەربەستیەی داوای دەکەین بۆ ئەو ئافرەتانەیە کە بێگانەن. یاخود بە دەم داوای سەربەستی دەکەین و لە کرداریشدا چمکی نەریتە کۆنەکان بەرنادەین دەبێ پیاو لە قووڵایی دڵیەوە نەك بە دەم و سەرزاری گەیشتبێتە ئەو ئەنجامەی کەوا ئافرەت نە شەیتانەو نە فریشتە، ئادەمیزادێکە کت و مت وەك خۆی، دەبێ پیاو بە دڵ، دان بەوەدا بنێ کە مافی ئافرەتی خواردوە، وا نەزانێ کە ئەو مافانەی خۆی هەیەتی ڕەوایەو نەمرەو دەبێ هەیبێ، واتا دەبێ هەر دەسەلاتدار بێ و ئافرەت ژێردەستە.

بێگومان پێشکەوتن و سەربەستی ئافرەت بەندە بە پێشکەوتنی ئەو کۆمەڵەوە، پێشکەوتنی کۆمەلایەتیش بەندە بە چۆنیەتی پێکهاتنی خێزانەوە، کە کۆمەڵ لە خێزانان پێك هاتوە، بەلام سەبارەت بە خاڵی یەکەم ئەوە ناگەیەنێ کە سەربەستی ئافرەت بخرێتە پشتگوێ و بدرێتە دەست مێژوو، وە وا دانەنرێ کە پێویستی بە تێکۆشان نیە چونکە بەندە بە پێشکەوتنی کۆمەڵەوە.

بەڵکو وا ڕاستە کە بەم جۆرە لێکبدرێتەوە کەوا ئافرەت نیوەی کۆمەڵەو مەسەلەی سەربەستی ئافرەت یەکێکە لە مەسەلە گرنگەکانی گەل کەواتە تێکۆشان لە پێناوی گەلدا تێکۆشانە لە پێناوی سەربەستی ئافرەتیشدا، کەواتە ئافرەت کە تێدەکۆشێ لە پێناوی سەربەستی یا تێدەکۆشێ لە پێناوی گەلدا لە هەموو لایەنەکانی ترەوە.

بەلام تێکۆشان لە پێناوی سەربەستی ئافرەتدا نابێ هەر لەسەرشانی ئافرەت خۆی بێ، بەڵکو لەسەر شانی پیاویش بێت و ئەم تێکۆشانەش بە وشیار کردنەوەی هەردوولایان دەبێ لەم لایەنەوە.

**سەربەستی خۆشەویستی:**

ئەمە نەبێ بە تاوانبارکردنی ئافرەتان دەڵێم هەرکە باسی سەربەستی ئافرەت دەکرێ، ئافرەت خۆی بە تایبەتی ڕۆشنبیرانیان سەربەستی خۆشەویستیان بە بیردا دێت وەك هەموو لایەنێکی ژیان هەر لەوەدا کۆبووبێتەوە، بێگومان دەبێ ئافرەت لە شووکردندا سەربەستی هەبێت، کە ئەوە بوو، بنچینەی ئەو خێزانە پتەو دەبێ بەلام ئەگەر بە نابەدڵی بدرێ بە شوو ئەوا ڕوودەدات کە ئەو خێزانە بکەوێتە ناو گێژاوی پەشێویەوە، گەلێ جاریش ئەو نابەدڵیە دەبێ بە هۆی ئەوەی کە ئەو ژن و مێردە نەمێنن و ئەم خێزانە گیرۆدەی ئاژاوە بێت و منالەکانیشیان باش پەروەردە نەبن لەبەرئەوە کە کچ دەدرێ بە شوو دەبێت پرسی پێ بکرێ، بەلام ئایا ئەم سەربەستیە دەشێ کە بێ سنوور بێت، بێگومان ئەگەر سنووردار نەبێ دەبێ بە هۆی ئاژاوەیەکی کۆمەلایەتی، کەواتە دەبێت چۆن چاری ئەم سەربەستیە بکرێ، یان بڵێین چۆن سنووری بۆ دابنرێ. بێگومان ڕێی ڕاست لەم کارەدا ئەوەیە کە داوای کچ کرا، ئەمجا ئەو کچە خۆی ئەو کوڕەی هەڵبژاردبێ یان نا، ئەوە ڕەنگە کەسوکار نەیزانن، بە هۆی دایکیەوە یان هەر کەسێکەوە دەبێ پرس بەو کچە بکرێ کە ئایا پێی ناخۆش نیە ببێ بە هاوسەری ئەو کەسە.. ئەمە بە پێی ئاینیش هەروایە.. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ڕوودەدات کە لە ئەنجامی هەڕەشەدا ئەو کچە وا لێ بکرێ بڵێ ئا، یان بڵێ نا.. کەواتە چار چیە؟ چار هەر ئەوەیە کە ئافرەت لە رووی کۆمەلایەتی و بیروهۆشەوە بگەیەنرێتە ئەو ئاستەی ئەگەر ڕازی نەبوو بڵێ ڕازی نیم، وە دەبێ ئەمەندە بواری درابێتێ کە بتوانێ پەنا بەرێتە بەر یاسا.

لێرەدا ئەو پرسیارەمان دێتە ڕێ کە دەڵێ سەربەستی خۆشەویستی سەبارەت بە ئافرەت ئایا ئەشێ موتڵەق بێ واتا بێ سنوور بێ وەکو لە پێشیشەوە پرسیمان؟

بێگومان ئەگەر سەربەستی خۆشەویستی بێ سنوور بێ وا دەگەیەنێ کەوا کچ لە بەکارهێنانی ئەم سەربەستیەدا هیچ لایەنێکی تری ئابوری و کۆمەلایەتی لێکنەداتەوە کە لە کۆمەڵی ئەمڕۆی ئێمەدا ئەم چەشنە هەنگاوە گەلێ ئەنجامی ناهەمواری دەبێت، بۆ نمونە لە رووی دەرامەتەوە ئەگەر کچ سەربەستی بێ سنووری هەبێ لە شوو کردندا واتای ئەوەیەکە دەشێ شوو بە یەکێ بکا کە نەتوانێ دەرامەتی مسۆگەر بکات کە زۆربەی ئافرەتانیش کە بیانوون واتا نان پەیاکەر نین نا خۆرن (لە شارەکاندا) هەروەها کە ئەو خۆشەویستییە بێ سنوور بوو بایەخی باوك یان گەورەی ئەو کچە نامێنێ و شیرازەی خێزان ئەپچڕێ، کەواتە دەبێ کچ بە نابەدڵ نەدرێ بە شوو، پرسی پێ بکرێ نەك ئەو خۆی بێ پرس شوو بکات، وە ئەگەر زۆری لێکرا دەتوانێ پەنا بەرێتە بەر یاسا.

**سەرچاوە:**

ئافرەتی لادیی کوردو سەربەستی، کامەران موکری ١٩٧٨، ل (٢٢-٢٥).

# کێ سلێمانی ناونا شاری هەڵمەت و قوربانی؟

مارف ناسراو

زیاتر لە نیو سەدە لەمەوبەر، لە کاتی خۆپیشاندانەکانی جەماوەری خەڵکی عیراق و بە تایبەتی شاری سلیمانی لە دژی مۆرکردنی (پەیمانی شوومی پۆرتسمۆس) سەرانسەری وڵات لە هەڵەچوون و هیرش و هەلمەت بردن و بە گژاچوونەوەدا بوو، ئا لەم شارە چنگ بە خوین و جەرگ هەلقرچاوەدا، لە ریزی پیشی پیشەوەی ئەو خۆپیشاندانانەدا، لاویکی باڵا بەرزی تیکسمراوی چاوو برۆ گەشی گەنم رەنگی کەلەگەتی بۆشناخ بەسەر دەست و کۆلی جەماوەرەو بە دەنگە بەرز و زوڵاڵە خۆشەکەی هاواری ئەکرد ئەیوت (ئەی جەماوەری تیکۆشەری شاری هەلمەت و قوربانی).. تا، بەلێ لەو رۆژەوە ئەم شاری سلیمانییە ناونرا شاری هەلمەت و قوربانی.. ئەو لاوە تیکۆشەرە دلسۆزو نەتەوەپەرستە، شاعیری نویخوازی کوردایەتی و پیشرەوی هەموو هەلمەت و خۆپیشاندانەکانی ئەوسای رژیمی کۆنەپەرستی پاشایەتی، (کامەران موکری) بوو.. کە لە پشکۆی خەبات و تیکۆشانی رۆژە سەختەکانی بەرەو رووبوونەوەو بەگژاچووندا، لە هەموو شیعرەکانیدا گیانی بەرگری و هەلمەت و هیرش بردنە بۆ سەرقەلای پۆلایینی زولم و زۆرداری و داکۆکی کردن لە چەوساوەو رەش و رووت و بەشخوراوانی نەتەوەکەی، بۆیە بە سەدان بگرە هەزاران پیشمەرگەو تیکۆشەری لە ریی شیعرە گراوییەکانیەوە بۆ پیگەیاندین و ئامادەیی ناو شۆرشی ئەیلول و شۆرشی نویی نەتەوەکەمانی، بۆ رزگاری و سەرفرازی گۆشکرد..

(وتیان ئەو رییەی کە تۆ لەسەری
مانای ئەوەیە بە لاوی ئەمری
منیش پیم گوتن، ئەم رییە نەگرم
بە گەردن کەچی و کەساسی ئەمرم

چواردە ساڵ بەر لە ئەمرۆ ٨/٧-١٢-١٩٨٦ داو لە دوا ماڵئاوایی کردنی لیمان تەنیا جاریك کۆریکی بۆ گیراو یەکدوو نووسینیشی لە لایەن بەریزان مامۆستا دکتۆر ئیحسان فوئاد و مامۆستای چیرۆکنووس (حەسەن جاف)ەوە لەسەر نووسرا، ئەمە ویرای ئەوەی کاتی خۆی کە لە ژیاندا بوو چەندین وتارو نووسینی شایستەی خۆی لەسەر نووسرا، یەکیك لەو نووسەرانە مامۆستای ئەدیب و رۆماننوس (حسین عارف) بوو کە کتیبی کامەران و هۆنراوەی نویی لەسەر نووسی، هەروەها دکتۆر کامیل حەسەن بەصیریش کتیبی (کامەران شاعر من کردستان)ی لەسەر بلاوکردەوە. کامەران لە ژیانی سیاسیدا حەڤدە جار گیراوەو هەر جارەو ٣ ساڵ و ٢ ساڵ زیندانی بوە، کە بەسەریەکەوە زیاتر لە شەش سال و چەند مانگیك بوەو چەندین جاریش دوورخراوەتەوەو دەست بەسەر بوە.

کەواتە گولی تەمەنی لاویتی بە دەم گیژەلوکەو گەرداوی راونان و گرتن و خۆشاردنەوەوە بوە، بۆیە نەیتوانی دوای دواناوەندی ئیتر بخوینێ.. ئەم شاعیر و تیکۆشەرەمان لەبەر خانەقا لە گەرەکی دەرگەزینی شاری هەلمەت و قوربانی لە سالی ١٩٢٩دا لە بنەماڵەیەکی کوردپەروەر و رۆشنبیردا چاوی هەڵهیناو بە هەمان نەریتی ئەوسای باو، خرایە حوجرە لای مامۆستا مەلا شیخ نەجمەدین و دواتر چوە قوتابخانەی خالیدیەی سەرەتایی، لە رۆژی پینج شەمموواندا خویندنەوەی شیعر لە گۆرەپانی قوتابخانەدا هەر حەمەکەی ئەحمەدی تەها بوو، ئیتر لەو رۆژەوە بوە دۆستی شیعر، بەلام ئەمجارەیان بە دەنگی بەرز و زولاڵ لەناو ئاپۆرەی جەماوەردا بۆ هاندان و بەگژداچوونەوەی زولم و زۆرداری چەوسینەران لەو رۆژەوە رووبەرووی زیندانەکانی (نوگرە سەلمان و بەدرە) کرایەوە هەر لە زیندانی بەدرە بوو دۆستایەتی و هاورییەتی لەگەڵ شاعیری گەورەمان (گۆران)ی مەزن پەیداکرد. ئەوەتا خۆی باسی ئەم هاورییەتیە لە یاداشتەکانی سالی ١٩٥٤ داوا ئەکا (شیعر بە جۆرێ شەیدای کردم، لەناو هەزاران و هەزاران کەسا زریکانم و بانگم کرد.. ئاگر بەربوە لە جەرگی هەست و نەستم! ئەو هۆنراوەیەش جاریکی تر بردمیەوە زیندان و بەرەو (بەدرە)ی کردمەوە، لەوێ بووم بە هاوریی گۆران، لە بەندیخانەدا گۆرانم دی و بووین بە هاورێ؛ ئەگەرچی لەوەپیش لە سلیمانی یەکترمان ئەناسی بەلام هیچ پەیوەندییەکی ئەوتۆ لە نیوانماندا نەبوو، دوای بەندیخانە کە نیررایین بۆ بەدرە زۆرتر لە یەك نزیکبووینەوە، بەلام نە من لای ئەو ئەموت خەریکی هۆنراوە نووسینم و نە ئەویش منی بە شاعیر دادەنا! تەنیا یەکجار لە باسی هۆنراوەدا وتی: (ئەو هۆنراوەیەی کە لەسەری گیراوی هەولیکی باشە بۆ فیربوون..!!). ئەم لاوە تیکۆشەرە گومناوە کە بە راستی وەك وەفاو ئەمەکداری بۆ دلسۆزی و تیکۆشان و هەول و خەباتی لە ژیاندا ئەبوایە لایەنی کەم سالانە لە شوینیکی دیارا یادی بکریتەوە.. کامەران موکری نەك وەك هەر تیکۆشەرو شاعیریکی راستی کوردایەتی و مرۆڤایەتی بوو، بگرە رۆژنامەنووسیکی بە تواناو هونەرمەند بوو، هەمووومان قەرزاری ئەوین، گەواهی بەلگەنەویستی ئەم راستیەش گۆڤاری رووگەشی سیاسی (رۆژی نوێ)ی رازاوەو

قەشـەنگە لـەو كاتـەدا كـە ئـەم هـەموو پیشـــكەوتنانە لـــە رووی چـــاپكردن و ئامیرەكانیەوە لە ئارادایەو، سەردەمی ئـەو ئەنتـــەرتایپ و لاینۆتـــایپ چاپەمەنیـــەكی دواكەوتوو بوو، جگـە لـەوەی سەرنووسـەر بوو هەموو بابەتەكانی ئامادە دەكرد بەسەر لاپەرەكاندا بەشی دەكردن و ریكی دەخستن و ویـــرای گـــەران و ســـۆراغ لـــە دووی بەلگەنامـەو وینـەی دانسـقە بـۆ گۆڤارەكـە كـاری هەلـەبری و تەنانـەت دەرزیلیدانـی گۆڤارەكـەی خستبوە ئەستۆی خـۆی هـەر لەبەرئـەوەی لـە كـاتی خۆیدا بیْدواكـەوتن زوو بگاتـە خویندەوارانی. ئـەم گۆڤـارە لـە بەهاری سالی ١٩٦٠ەوە هەژدە ژمارەی ریك و پیكی دەولەمەندو پر لە بابەتەكانی میژوو و زانست، ئەدەبی، رەخنە، فەلسەفەی تیادا بوو. بەلی من تا ئەمرۆ چەند جاریك وتارم لەسەر نووسیوەو لـەو وتارانـەدا بـە تكاوە داوام لـە دلسـۆزانی حكومـەت كـردوە هـەر هیچ نەبیْ لە شارەكەی خۆی شاری هەلمەت و قوربانی پەیكـەریكی بـۆ دروسـت بكـەن.. ئەمرۆش لە یادیی چواردە سال بەسەر دوا مالئاواییـەیدا جـاریكی تـر ئـەلیم (بـۆ ئـەم شاعیرە گەورە تیكۆشـەرەمان كە مامۆسـتا حەسـەن جاف دەلـیْ (كامـەرانی مـرۆڤ و تیكۆشەر و شاعیر كە تا مرد نرخ و بەهای شیعرو ئـەدەب و ویژدانی مرۆڤانـەی خـۆی وەك گلینـــەی چاوەكـــانی پاراســـت.. نـــە دەستی بۆ كەسیْ دریژكرد، نـە سـەری بـۆ كەسیْ دانەواند، نە ژیان و ئەركی ناخۆش و پەیكـەریك بـۆ كامـەران موكـری ئـەركی دلسـۆزانی حكومـەتی بـە شـكۆی هـەریمی كوردستانە، چونكە كامـەران تـا ئـەو رۆژەی چاوی لیك نا، كۆلنەدان و ترسانی نەئەزانی چییە.. ئەم كۆپلە شیعرەش دوا شیعریتی:

ئەگەرچی دلی سەردەمی لاویم
بلیسەی بەرزی كوردستانم بوو
بازووی بەهیزو چنگی خویناویم
نیشانەی زەبری تیكۆشانم بوو
بەلام پیریكەم سوتینەرترە
چونكە نەك هەر دل.. بوونم ئاگرە

(لـە یاداشـتـەكانی كامەرانـەوە سـالی ١٩٨٦)

**كەلك لەم سەرچاوانە بینراوە:**

١-كـاروانی نویـی شـیعری كـوردی/ بەرگی یەكەم/ كاكەی فەلاح.
٢-یاداشـتـەكانی كامـەران موكـری/ ١٩٨٦.
٣-رۆژنامەی هەریكی كوردستان ژمارە (٢٣٥) ٢٤/٧/٢٠٠٠.
٤-رۆژنامـەی رۆژانـەی سلیمانی ژمارە (٦٤) سالی دووەم ٢٦/٧/٢٠٠٠.









# نمونەی چەند موحازەرەیەکی مامۆستا کامەران موکری لە زانکۆی سلێمانی

ئامادەکردنی: عەباس ساڵح عەبدوڵا
زانکۆی سلێمانی- کۆلیژی پەروەردە

کامەران موکری جگە لەوەی شاعیرێکی خەباتکەر و ئازادیخوازی سەردەمەکەی خۆی بوە لە بوارەکانی تری ئەدەب و هونەردا ڕۆڵێکی دیاریان هەبوە، جێدەستیان لە چیرۆکی کوردی و هونەری شانۆ و ڕۆژنامەنووسی و وتاربێژیدا دیارە. جگە لەم بوارانە کامەران بۆ ماوەی دە ساڵ لە زانکۆی (سلێمانی و سەلاحەدین) مامۆستایەکی وانەبێژی سەرکەوتوی پرۆسەی خوێندن بوو بە تایبەتی لەوانەکانی ڕەوانبێژی و زانستی عەرووز و تیۆری ئەدەبیدا سوودی بە خوێندکاران گەیاندوە. من بۆ ماوەی چوار ساڵ خوێندکاری مامۆستا کامەران بووم و مامۆستا هەمیشە بە چاوی هاوڕێ و برا دەیڕوانیە خوێندکارەکانی و هەر بۆیە مامۆستایەکی خۆشەویستی ناو خوێندکارەکانی بوو، ئەوەی ڕۆژێ وانەی لای ئەم مامۆستا بەرزە خوێندبێت هەرگیز وێنەی ئەم مامۆستایەی لەبەرچاو ون نابێت و زۆرجار ڕوە خۆشەکەی و هەندێ جاریش تورەبوونە لە پڕەکەی و ڕوخسارە خەماویەکەی و هەڵوێستەکانی دەبنە خەونێکی خۆش و بە ناخی خوێندکارەکانیدا گوزەر دەکەن. من وەکو وەفایەك هەندێ لەو موحازەرانەی کە لە پۆلدا پێی نوسیوینەتەوە وەکو خۆی و بەبێ دەستکاری دەخەمە بەرچاوی خوێنەران بەو هیوایەی خزمەتێکی بچوکم بەو مامۆستا بەڕێزەم کردبێت.

## زانستی عەروز

مانگی (١٠) ساڵی ١٩٧٩

ئەو زانستەیە کە کێشانەی هۆنراوەی پێدەکرێت لە ڕووی کێش و قافیەوە، بۆ ئەوەی دەرکەوێت ئەو هۆنراوە کێشانە کراوە دروستە یان لاسەنگە، وە کەم و کورتی چییەو بتوانرێ دەستنیشانی ئەو کەموکورتیانە بکرێت.

ئەم زانستە کە ناونراوە عەروز تایبەتە بە هۆنراوەی عەرەبی ئەمجا هۆنراوەی ئەو نەتەوە موسڵمانانەی کە لەسەر ڕێبازی ئەوان ڕۆیشتون.

وشەی عەروز هەندێ دەڵێت لە (عارضە)وە هاتوە گوایە نیرگە کە دەدرێتە بەر ڕەشماڵ یان دەوار وە دەشڵێن بەناوی ئەو شوێنەوە ناونراوە کە دۆزەرەوەی ئەم زانستە کە خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فراهیدییەو شوێنەکەش شاری مەککەیە. وە دەشڵێن ڕەنگە وشەی عەروز لە سیفەتی حوشترەوەوە وەرگیرابێت بە واتای "چەموش".

هەرچۆنێك بێت ئەم وشەیە لەناو جەرگەی ژیانی گەلی عەرەبەوە هەڵقوڵاوە و زاراوەکانیشی هەر بەو چەشنە لە ژیانی ئەو گەلەوە پەیدابوون کە ژیانێکی دەشتەکی بوە.

## بڕگە لە زمانە هیندو ئەوروپاییەکاندا:

١٩٧٩/١١/١٦

ئەوەی ئێمە زیاتر مەرممان بێت ئاڤێستایە کە کتێبی پیرۆزی زەردەشتە، ئاڤێستا زمانێ بێت لە زمانە ئێرانیەکان یان ڕەسەنی زمانی کوردی بێت بەراورد کردنی هۆنراوەکانی لەگەڵ کوردی پێویستە، چونکە هیچ نەبێ دەتوانین بڵێین زمانێکە لە ڕەسەنی زمانی کوردیەوە نزیکە. زەردەشت خۆی لە ورمێ لەدایك بوە لە ساڵی (٦٦٠ پ.ن) کە ورمێ ئەوساش و ئێستەش بەشێکە لە هەرێمی کوردستان.

بەشێك لە ئاوێستا ناوی گاتایە بە واتای سرووود یاخود گۆرانی. ئەم گاتایانە هۆنراوەن وە هەموو بڕگەکانیان کورت و درێژن و کێشەکانیشی وەکو کێشی هۆنراوەی کوردی ئەمڕۆ وایە بە تایبەتی کێشی (٧، ٨، ١٠، ١١، ١٢) بڕگەی، هەروەها کێشی (١٤، ١٦) بڕگەیشی تیایە کە ئێستا بە دەریای عەرەبی دراونەتە قەڵەم.

## کێشی بڕگەی کوردی

١٩٨٠/٤/٢٨

هۆنراوەی کوردی لەسەر دوو چەشنە کێش ڕێکخراوە کێشی عەروزی و کێشی پەنجە یان بڕگەیی کە کێشێکی کۆن و ڕەسەنی کوردیە. ئەم جۆرە کێشە بریتیە لە کێشانە کردنی هۆنراوەکە بە پێی ژمارەی بڕگە نەك بەرامبەرکردنی بڕگەی کورت و درێژ و ئەم جۆرە کێشە پێی دەوترێ کێشی بڕگەیی چەردەیی (کمیە). ئەوەی تا ئەمڕۆ ساخ بۆتەوە ئەوەیە کەوا ئەم کێشە کوردیە بریتیە لە پێنج بڕگەیی، شەشی، حەوتی، هەشتی نۆیی، دەیی هەتا دەگاتە پانزە. ئەگەرچی هێشتا ساخ نەبۆتەوە کە کێشی چواردە بڕگەیی عەروزەیان کوردیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کێشی چواردە بڕگەیی و شانزە بڕگەیی لە ئاڤێستادا هەیە.

### چەند نمونەیەك

کێشی پێنج بڕگەیی:

ئەم کیشە لە کیشەکانی تر کەمتر بەکارهاتوە، لە خوار ئەمەوە هیچ کیشیکی تر نیە، چونکە چوار برگەیی پارچەی هەشت برگەییە.

کوانێ زولفی ڕەش
کولمی ئال و گەش
کوا / نێ / زوڵ / فی / ڕەش
کوڵ / می / ئا / ل و / گەش

کیشی شەش برگەیی:

کوا هەیکەلی جەمال
کوا حوسنی بێ میسال
کوا / هەی / کە / لی / جە / مال /
کوا / حوس / نی / بێ / می / سال /

کیشی حەوت برگەیی:

مانگ دەمی ماچ کردم کەش
هات و من گرتمە باوەش

مانگ / ده / می / ماچ / کر / دم / گەش /
ها / ت و / من / گر / تمە / با / وەش /
کێشی هەشت بڕگەیی:
ڕوومەتی وەك گوڵی بێگەرد
قژی خاو ئاوریشمێکی زەرد
ڕوو / مە / تی / وەك / گو / ڵی / بێ / گەرد /
ق / ژی / خاو / ئاو / ریش / مێ / کی / زەرد /
کێشی ده بڕگەیی:
سـەرداری هـەموو کێشـە کوردیەکانـە، کـە گشـت هۆنـراوەی مەولەوی و هۆنراوە فۆلکلۆریەکان لەسەر ئەم کێشەن:
یاران لە جەرگم یاران لە جەرم
تیری شەم ئەم شەو درا لە جەرگم
یا / ران / لە / جەر / گم / ..
تی / ری / شەم / ئەم / شەو / د / را / لە / جەر / گم
کێشی یازده بڕگەیی:
زۆر کـەم بـەکارهێنراوە بـە تایبـەتی لـە هۆنـراوەی فۆلکلـۆردا ئەگـەرچی ئـەم کێشـە لـە ئاڤێسـتادا هەیـەو دادەنـرێ بـە کێشـی هۆنراوەی کوردی.
قژی نەرمت وەکو تاڵی خۆرەتاو
لەسەر شان و قۆڵی سپی پەرش و خاو
نەغمەی شیرین ئاوازی خۆش لە دەنگا
وشەی سەرنج لەناو چاوێکی مەنگا
خاڵێکی کاڵ نەخشێکی جوان لەسەر ڕوو
بەژن و باڵات وردیلەو ڕێك و هەڵچوو
زەردەخەنەی ئەو ڕوە هی ئەو لێوە
فریشتەی هەست هی ئەم دڵە بزێوە

ق / ژی / نەر / مت / وە / کو / تا / ڵی / خۆ / رە / تاو
لە / سەر / شا / ن و / قۆ / ڵی / س / پی / پەر / ش و / خاو
کێشی دوانزە بڕگەیی:
لە هۆنراوەی هـەندێ شاعیردا بە ڕادەی یەکـەم گـۆران ئـەمجا کامەران نەبێ زۆر کەم بەکارهاتوە:
قژ کاڵی لێو ئاڵی پرشنگی نیگا کاڵ
ئەی کچە حوانەکەی سەر گۆنا نەختێ ئاڵ
قژ / کا / ڵی / لێو / ئا / ڵی / پر / شن / گی / نی / گا / کاڵ
ئەی / ك / چە / جوا / نە / کەی / سەر / گۆ / نا / نەخ / تێ / ئاڵ
کێشی سیانزە بڕگەیی
ئەم کێشەش بە دەگمەن بەکاردێ
لەناو باخی دڵی منا تەنیا خەزانە
گوڵ ناپشکوێ بولبل زەبون گەڵا ڕێزانە
لە / ناو / با / خی / د / ڵی / م / نا / تەن / یا / خە / زا / نە
کێشی چواردە بڕگەیی:
ئـەم کێشـە تـاکو ئێسـتا سـاخ نەبۆتـەوە کـە ئایـا کوردیـەکی ڕەسەنە یا عەروزیە
ساقی لە پەردە دەرهات جامێ شەرابی هێنا
دڵ حیرە ما لە خیرەت مەه ئافتابی هێنا
سا / قی / لە / پەر / دە / دەر / هات / جا / مێ / شە / را / بی / هێ / نا
کێشی پانزە بڕگەیی:
ئەم کێشەش گومانی تیایە ئەگەرچی هۆنراوەی مستەزاد کە داهێنراوی ئێرانیەکانە بەم کێشەیە:
گۆڕاوم وێنەی جاران نەماوم.. بینایی چاوم
عەشقت لە دڵما دامردۆتەوە.. هێزو هەناوم
گۆ / ڕا / وم / وێ / نەی / جا / ران / نە / ما / وم.. بی / نا / یی / چا / وم

## هۆنراوەی ئازاد ١٩٨٠/٥/١٤

ئەگـەرچی وا لـە قەڵـەم دراوە کـە گوایـە هۆنراوەی ئـازاد لـەناو هۆنـراوەی عـەرەبیدا لـە سـاڵی ١٩٤٧دا سـەری هـەڵداوە، هـەندێ دەڵێن لەسەر دەستی نازك مەلائیکە وە هەندێکی تر دەڵێن لەسـەر دەستی بەدر شاکر سەیابدا هاتۆتە کایەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێشـتر هۆنـراوەی ئـازاد هـەبوە کـە لـە لایـەن دەسـتەی ئـەپۆلۆی میسریەوە کـە گۆڤاری ئەپۆلیان لـە سـاڵی ١٩٢٥ ز دا دەرکـردوە. ئەم چەشنە هۆنراوەیە پەیدابوە.

بەڵام ئەگەر بێت و هۆنراوەی بەند بە ئازاد دابنرێ سـەردەمی ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی عەباسیەکان و موەشـەحاتی ئەندەلوسـی هـەر بـەوە دادەنـرێ، بـەڵام جیـاوازی لـە نێـوان بـەندو هۆنـراوەی ئازادی لەوەدایە کە کێشی بەند هـەموو پارچەیەکی دەبێ کێشی بەیتـەکانی بەرامبـەر بە یەك بن یان وەك یەك بـن، بـەڵام ئەمـە لـە هۆنراوەی ئازاددا نییە.

سـەبارەت بـە کوردیـش ئەگـەر بێـت و لاوك و حـەیران بـە هۆنراوەی پەخشانی دانەنرێت ئەوە مانای ئەوەیە کە هۆنراوەی ئازاد دەگەڕێتەوە بۆ لاوك و حەیران، بەڵام بەم شێوەیەی کە ئەمڕۆ هەیـە سـەردەمی دەگەڕێتـەوە بـۆ پـەنجاکان واتـە دوابـەدوای هۆنراوەی ئازادی عەرەبی، لەم ڕووەوە نازك مەلائیکەو بەدر شکر سەیاب و عەبدولوەهاب بەیاتی، کاریان کردۆتە سـەر هۆنـراوەی ئـازادی کـوردی ئەگـەرچی بـە شـێوەی بـەند پـیرەمێرد لـە سـاڵی ١٩٢٤دا هۆنراوەی بوە. داهێنـەری هۆنراوەی ئـازادی کـوردی لـە پەنجاکاندا یەکـەمیان (نـوری وەشـتی)یـە وە دوای ئـەو (کامـەران موکری)یە، بەڵام ئەوەندە هـێرش برایـە سـەر نـوری وەشـتی بـە تایبەتی لە لایەن نجم الدین مەلاوە دەستی لە هۆنراوە هـەڵگرت. کامەرانیش لە ١٩٥٤دا هۆنراوەی ئازادی وتوە لەبەرئەوەی ئامانجی لە هۆنراوە وتنا بڵاوکردنەوەو گەیاندنی بیروباوەڕی خۆی بوو بە جەماهیر وە زانی ئـەو خەڵکـە لـەو جـۆرە هۆنراوەیـە کاریـان تـێ ناکات دەستی هەڵگرت وە بایەخی دا بە کێشی ڕەسەنی کوردی و هۆنراوەی چوارین.

هۆنـراوەی ئازاد بریتیـە لـە هۆنراوەیـەکی کێشـدار کـە شـەتر (نیوە دێڕی یەکەمی بەیت) یان بەیتی تیا دەجنرێت وە لە جیاتی ئەوەی کە هەر شەترێك چەند بڕگەیەك بێت ئەوەندەی بڕگەکانی شەترەکانی تر ئەو شاعیرە ژمارەی بڕگەکان زیاد و کەم دەکات بۆ ئەوەی بتوانێ بە ئاسانی مەبەستی خۆی دەربڕێت، هەروەها لـە ڕووی قافیەوە لە جیاتی قافیەی ستوونی یاخود جووت قافیـەکان بە پێی شـەترەکان خۆی دابەش دەبێت بەبێ ئـەرکی شـاعیرەکە. بەڵام بە گوێرەی کێشەکانی کوردی هۆنراوەی ئازادی ئەمڕۆ زیـان دەبەخشێ لە ڕووی کەلەپورەوە، چونکە هـەر کێشـی جـووت نـەبێ بەشـناکرێ یان بڵێن ناجنرێ، هـەندێ کێشـیش یـەك جار دابـەش دابەش دەکرێت کە مۆسیقای هۆنراوەکە دەشـێوێنێ، بـۆ نمونـە کێشـە تاکـەکان وەکـو پێنـج بڕگـەیی و حـەوت بڕگـەیی و یـانزە بڕگەیی هیچیـان هۆنـراوەی ئازادیـان لەسـەر نـاوترێ. وە کێشـی شەش و دە بڕگەیی یەك جار دابەش دەکرێ لەبەرئەوە بە لایـەنی کەمەوە لە سەدا نەوەدی هۆنراوەی ئازادی ئەمڕۆ لەسەر کێشی هەشتە چونکە لە دابەشکردنا دەتوانێ کێشی چوار و دوانزەش پەیڕەو بکات.

## "ڕەوانبێژی"

مانگی پێنجی ساڵی ١٩٨٠ پۆلی سێهەم/ کۆلێژی ئاداب

هۆنراوە کە پێکدێ لە ناوەڕۆك و ڕوخسار، لە یەکەم سەرنجدا دەربارەی ڕوخسار وا دێتە بەرچاومان کەوا بریتی بێت لە وشەو سەروا بەڵام لە زیاتر لێ وردبوونەوە دەردەکەوێ کە ڕوخساری هۆنراوە بێجگە لەو بنەڕەتیانەی کە دیاریمان کرد جۆری دەربڕینی بە شێوەیەکی هونەری دەبێت بە بنەڕەتێکی سەرەکی، دەتوانین بڵێین ئەو جۆری دەربڕینە شارەزاییەکی دەوێت و ڕێ و شوێنی خۆی هەیە، واتە دەربڕینێکی سادە نەبوە و دەتوانین پێی بڵێین هونەری لەسەر ڕێیەکی تایبەتی کە پێی دەوترێ ڕێبازی (بەلاغی) کەواتە بەلاغە وەکو زانستێك بریتیە لە چۆنیەتی بەکارهێنانی وشە بۆ دەربڕینی مەبەست. لە عەرەبیدا کە ناونراوە بەلاغە وشەکە لە (بلوغ)ەوە هاتوە گوایە مەبەست ئەوەیە دەربڕینێك بگەیەنێت بە ئەنجام، کەواتە گوێگر یا خوێنەر بە جۆرێکی کاریگەرانەی ئەوتۆ تێی بگات لە بیری نەچێتەوە لە کوردیدا بەلاغە ناونراوە ڕەوانبێژی واتە وتنێك بە شێوەیەکی ڕەوان. بێگومان ئەم هونەرە بریتیە لەوەی کە تۆ دەدوێیت یا دەنوسی چ پەخشان یان هۆنراوە هەوڵ دەدەیت بە جوانی و ڕەوانی کارەکە.

لە کوردەواریدا دەڵێن (بیگێژە، بیبێژە، بیوێژە).

ڕەوانبێژی بریتیە لەم بەشانە

١-البیان: ڕوونبێژی ٢-البدیع: جوانبێژی

٣-المعانی: گوزارەبێژی

ڕەوانبێژی هەروەك گەلێك هونەر و زانستی تر لە ئەدەبی کوردیدا، زمانی عەرەبی لە ڕێگەی ئاینی ئیسلامەوە کاری تێکردوەو هەروەها کاری کردۆتە سەر هۆنراوەی پێشینی کوردی، بە تایبەتی هۆنراوە ئاینیەکان، بچوکترین نمونە کە نزیك بێتەوە لە ڕەوانبێژی لەم دێڕەدا دەردەکەوێت:

لە جیاتی ئەوەی بڵێین (ڕوی جوانە) دەڵێین (ڕووی دەڵێی مانگە)، لێرەدا تەنها ئەوەی ڕویدا ناوە ئاوەڵناوەکە کە جوانیە لابراوە، ئاوەڵناوێکی شتێکی تری پێ بەخشرا کە بریسکەو ڕوناکیە.

### خوازە: المجاز

بەپێی گۆڕانی ئابوری کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کە ژێرخانی هەموو گۆڕانێکی لایەنەکانی تری ژیانە، لەوانەیە باری ژیانی کۆمەڵایەتی و زمانی نەتەوە بە شێوەیەکی سروشتی دەردەکەوێت کە ئەو وشە دروستانەی لەو زمانەدا دروست بوە و دروست دەبێت بەشی ئەو هەموو مەعنایە ناکات کە دێتە کایەوە، لەبەرئەوە مرۆڤ ناچار دەبێت وشەی تازە بۆ مەعنای تازە دابڕێژێت و لە هەمان کاتیشدا ناچار دەبێت وشەی زمانەکەی خۆی لە مانایەوە بخوازێ بۆ مانایەکی تر، کەواتە کە دەڵێن: شاخ، دار، دەست، گوڵ، ئەمانە وشەیەکی دروستن لە زمانەکە خۆیدا هەیە بەڵام هەندێ مەعنای تازە کە هاتە کایەوە هەندێ لەم وشانەی بۆ دەخوازێ بە تاك و کۆ و بە ڕستە بۆ ئەوەی وشەکان بەشی مەعناکان بکەن. کە ئەم خواستنانە: خوازەو درکەو خواتسن پێکدەهێنن. بۆ نمونە کە وتمان (گوڵەکە هات). گوڵ: ڕوەکێکە ناڕوات، وشە ڕەسەنەکەی بۆ گوڵ بەکارهاتوە ئاشکرایەو دروستە، کە دەڵێن: (گوڵەکە هات)، ئەم گوڵە خوازەیە چونکە مەبەستمان جوانێکە.

جیاوازی هەرە گرنگ و ئاشکرا لە نێوان خوازەو خواستندا (المجاز و الاستعارە) ئەوەیە کە خوازە بۆ ماوەیەکی هەمیشەیی و دوور و درێژ بەکار دەهێنرێ بەڵام خواستن بۆ ماوەیەکی کەم خایەن یان کاتی بەکاردەهێنرێ.

ئەرشیفی شانۆی کوردی

## کاوەی ئاسنگەر

کاوەی ئاسنگەر، ڕەمزی قارەمانێتی و ئازادی و بەردەوامیی، ئەو داستانە نەمرە بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٥٩دا لە شاری سلێمانی خراوەتە سەر شانۆ.. شانۆگەرییەك بوە لە نۆ دیمەنداو لە نوسین و دەرهێنانی مامۆستا کامەران موکری بوە. شانۆگەرییەکە کارێکی هونەریی جوان بوەو بە سەلیقەی هونەرمەندانەوە مامەڵە لەگەڵ (کاوەی ئاسنگەر)دا کراوە.

بە کورتی، ئەو شانۆگەرییە باسی لە زوڵم و زۆری ئەژدەهاك کردوە، پاشانیش ڕاپەڕینی گەل بە سەرکردایەتی "کاوە" و لەناوبردنی تەخت و تاراجی پاشای خوێنمژ.

ئەکتەرەکانی کاوەی ئاسنگەر بریتی بوون لە بەڕێزان:

-کامەران موکری- کاوە، -کەمالەدین حاجی تۆفیق- ئەژدەهاك - مەحمود عەزیز- وەزیر -گەلاوێژ سابیر کۆیی- ژنی کاوە -سوعاد سەعیدو پەروین عەزیز- کەنیزەك -جەلال وەستا ئەمین- هاوڕێی کاوە لەگەڵ تاهیر ساڵح سەعید.

شانۆگەرییەکە بۆ ماوەی (٩) ڕۆژ لەسەر شانۆی سانەویی سلێمانی پێشکەش کراوەو بینەرێکی زۆر بە دیتنی شادبوون و قازانجەکەشی بەسەر قوتابییە هەژارەکاندا دابەش کراوە. کارە هونەرییەکانی وەك دیکۆرو ماکیاژو دەنگ بە باشی جێبەجێ کرابوون. مامۆستا کامەران موکریی شاعیر گێڕایەوەو وتی: -لە شەوێکی نمایشەکەدا، کاتێ کاوە پەلاماری ئەژدەهاك دەدات، لە هۆڵەکەوە دایکی ئەژدەهاك (کاك کەمالەدین) هاواری کرد:

نەکەی دەستت شکێ.. منیش هەندێ شپرزە بووم، بەڵام خۆمم بە ئاگا هێنایەوەو دەورەکەم بە باشی تەواوکرد..

## کلۆڵان

ساڵی ١٩٥٢، یەکێك لە شاکارەکانی ئەدیبی گەورەی جیهانی (ڤیکتۆر هۆگۆ) لە شاری سلێمانی نمایش کراوە کە ئەویش چیرۆکی (کلۆڵان) بوە، ئەم بەرهەمە لە لایەن شاعیری کورد کامەران موکرییەوە ئامادەکراوەو هەر خۆیشی دەرهێنەری بوە بۆ سەر شانۆ.

ژمارەیەکی زۆر لە بینەران بەم شاکارە شادبوون و جێی سەرنجە ئەمڕۆش لە تواناادا نیە لەو جۆرە بەرهەمەی ئەدەبیات بخرێتە سەر شانۆ.

شانۆگەرییەکە لە هەشت دیمەندا بوەو لەسەر شانۆی هۆڵی سانەویی سلێمانی لەگەڵ شانۆگەرییەکی تردا نیشاندراون بە ناوی (سەری گلۆڵەکە) کە لە شانۆگەرییەکەی هونەرمەندی عێراقی (یوسف العانی)یەوە ئامادەکراوە.

شانۆگەرییەکە مانگێکی تەواو مەشقی لەسەر کراوەو بۆ ماوەی (٨) ڕۆژ پێشکەش کراوە. مامۆستا کامەران موکری هەر خۆی دەوری (ژان ڤاڵ ژان)ی پاڵەوانی شانۆگەرییەکەی دیوەو ئەکتەرەکانی تریش بریتی بوون لە بەڕێزان: محەمەد سدیق مەحمود، سمکۆ عەزیز، نەجات عەبدە، کەمال شێخ غەریب، حاتەم سەعید و کامیل ژیرو چەند ئەکتەرێکی تر.

کامەران موکری شاعیر باسی (کلۆڵان)ی بۆ کردین و وتی:

-ژان ڤاڵ ژان پاش ئەوەی ١٩ ساڵی ڕەبەق لە زینداندا دەباتە سەر، ئازاد دەکرێ، بەڵام لانیەك شك نابات تیایدا بحەوێتەوە، پاش ماوەیەك قەشەیەك دەیگرێتە خۆی، بەڵام ژان ناپاکی لەگەڵدا دەکات و گوڵدانێکی بەنرخی لێ دەدزێ و هەڵدێ، دوای ئەوەی پۆلیس دەستگیری دەکەن دەیبەنەوە بەردەم قەشەی دزلێکراو، بەڵام ئەو لێی دەبوورێ و ڕایدەگەیەنێ کە خۆی گوڵدانەکەی پێداوە.. پاشان ئامۆژگاری دەکات کە جارێکی تر دزی نەکات و ڕێگای هەڵە نەگرێتەبەر. ڕۆژانی نمایش بەسەر بینەرای پیاوان و ژناندا دابەش کراوەو نرخی بلیتی چوونە ژوورەوە ١٠٠ و ١٥٠ فلس بوە، لەگەڵ بلیتی تایبەتی.. لە دوای کۆتایی هاتنی شانۆگەرییەکەو تێپەڕبوونی ماوەیەك، هەرچەندە منداڵانی سلێمانی لە کوچەو شەقامەکاندا بە "کامەران" گەیشتبوون هاواریان لێ کردوە (دز.. پیاوکوژ.. تاوانبار)!. لەبەر سەرکەوتویی شانۆگەرییەکە، خاوەنی سینەمای ڕەشید لەودەمەدا فیلمی (کلۆڵان)ی بە ئینگلیزی نیشانداوە.

سەرچاوە:

لە ئەرشیفی شانۆی کوردییەوە، شانۆگەرییەکانی سلێمانی لە ساڵانی (١٩٢٦-١٩٦١)دا، یاسین قادر بەرزنجی، چاپی یەکەم (٢٠٠١)، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم.

# کامەرانی نەمر*

ئەستێرە کامەران موکری

ئەگەرچی دڵی سەردەمی لاویم
بڵێسەی بەرزی کوردستانم بوو
بازووی بەهێزو چنگی خوێناویم
نیشانەی زەبری تێکۆشانم بوو
بەڵام پیریەکەم سوتێنەرترە
چونکە نەک هەر دڵ بونم ئاگرە

ئای ساڵەکەی چەندە سەخت و پڕ لە وەیشوومەی نەگریسە.. لە ناوەختا بۆ چروکی هەناسەو داخ ڕووی ئاسمانی تەڵخ کرد.. ئاخ..

دە فرمێسک، لێزمەی بارانی ماتەمی بەخوڕ ببارێنە.. شەپۆلی کۆستی شینی نوێمان پاك بشۆرەوە.. بورکانی سەبوریمان بژێنەرەوە.

ئەی وڵاتی عەشقی پیرۆز، گوڵی ڕەنگین کلووی بەفری دووڕی، چیای سەرکەش و کوڕو هەڵچوو.

باوەش بە چەپکە گزنگی ئاڵتوونی خۆری بەری بەیاندا بەری..

دە تاوێک بگری و دەمێک خەندە بپژێنە..
دنیایەکی بەربڵاوو بەرین و جەنجاڵ و ئاڵۆزاوە.

ئای لەو ساتەی منالی ساوا بۆ یەکەمجار چاو بۆ ژیان دەکاتەوەو دەنگی واقەی دەبیسترێ.. ئای لەو دەمەی تەمەنی هەڵکشاو چۆن مرۆڤ لوول دەداو پەکی دەخات و لە پێ و زمان دەکەوێت.. ئا ئەوە دیمەنی شانۆیەکی سروشتی بێ ڕتووشە، خۆی لە سەرهەڵدانی دیاردەی فەلسەفەی ژیاندا دەنوێنێ.

نەمدەویست شەپۆلی شەماڵی سۆزی باوك و فرزەنی بە ڕووما هەڵکات.. بەڵام چ بکەم؟.. منێکی مرۆڤ وەك هەموان لە گۆشت و خوێن و ئێسك پێکهاتوە تاوێك پێدەکەنم و دەمێك دەدەمە پڕمەی گریان.

خەڵکینە لۆمەم مەکەن.. توخوا لۆمەم مەکەن.. من بۆ باوك و براو مامۆستای خۆم شین دەکەم.. بۆ کامەرانی باوك و شاعیر، بۆ مرۆڤێکی دڵ و مێشك گەورە.. ئەو مرۆڤەی ئێمەی پەروەردە کرد..



باوکە.. کامەران گیان.. قسە ئاساییەکانت چەپکە نێرگزو گوڵاڵەی بەهاری شیعر بوون. بەو شیعرانەت فێرت کردین هەمیشە دڵ پڕ لە هیواو دوور لە کین و بێ ورەیی بین: ئەتوت

گوڵاڵەی شادیم لە گەشیدایە
هیچ بایەک نییە هەڵی وەرێنێ
دڵیشم وەکو پارچە پۆڵایە
کەس توانای نییە تێکی شکێنێ

کامەرانی باوك و براو مامۆستا.. لەوەتی بویت ڕووباری ژیانت بە هێمنی ملدەنێت، دەشتی دەرونی پڕ لە گوڵی هیواو ڕەوشتی پاك و پیرۆز، مەلی هەست و سۆزت بە هیۆری ئاسمانی ساماڵی هەڵوێستا دەداتە شەقەی باڵ دوور لەوەی دەماری لە خۆبایی بوونت هەڵچێ:

لە خۆبایی بوون لە سەرکەوتنا
یا نائومێدی لەژێر کەوتنا
لەناو دڵێکا پەروەردە ئەبن
تیا نەبێ مانای ژیان و مردن

بابە گیان.. ئای لەو دڵەت، جگە لە خۆشەویستی مرۆڤ و خاك جێگای هیچی تری تیا نەبوو.. لە وشەی ڕەسەن، لە دەنگی خۆش لە دیمەنی جوان، لە ڕەوشت و هەڵوێستی بەرز هەوێنی شیعرەکانت پێکهێنا.

گوڵ بەو جوانییە لە کۆشی دڕکا
ئەگەشێتەوە پەڕەی ڕەنگینی
دڵ بۆ شادبگا بیەوێ بڕکا
ئەبێ بچێژێ تاڵاوی ژینی
هیواش لە کۆش ناسۆرو خەما
ئەپشکوێ خونچەی جوان و شیرینی

بابە گیان: تۆی خاوەنی شیعری نوێ، وەچەی نوێی ئەم خاك و خۆڵە. تەنیا ئێمەت بە جگەر سۆزی خۆت نەئەزانی تۆ دەنگی هەق پەرستی و خەمخۆری هەموو منالێك و دایکێکی لێقەوماو بویت.. هەر ئەشتوت:

تا منالێ ببینم بێ نەوا بێ
هەڵ بزڕکاو وەک گوڵی ژاکاو وابێ
تا ئافرەتی هەژار و بێ دەرەتان
هەڵ کرۆزاو گەردن کەچ و ڕسوابێ
لەگەڵ خەندە هەمیشە دوژمن ئەبم
لەگەڵ خەفەت هەردەست لە گەردن ئەبم

کامەرانی باوك و براو مامۆستام.. چرای قسەی شیرین و بەتامەکانت هەرگیز لە لۆچی مێشك و ناخی دەرونما ناکوژێتەوە.. ئەی ئەو مرۆڤەی نەتدەزانی کینوبوغز بەری کام درەختە..

دڵت پڕ لە عەشق و هیواو دەتویست هەموان ئا بەو جۆرە گۆش بکەیت.. بڕوات بە خۆت سەرکەوتنی دوارۆژ بوو.

هەرچی درەختە گڕی تێبەردەن
پەپوولەی هیوای من ناسووتێنێ
بای پایز هەمووی بەجارێ هەڵکەن
ئەم خونچە وردەی من ناوەرێنێ
چۆن ئەوە ڕۆژە ئەبینم هەڵات
ئاواش دڵنیام ئەگەیت بە ئاوات

دەمویست لە جیاتی دەستە خوشکەکانم بگریم و بۆت بلاوێنمەوە.. دەستی ناز و خۆشەویستی تۆیان بەسەردا بهێنم.. وتم نە تۆ هەمیشە دژ بە گریان بوویت.. کە ئێستا چاوی ئارام دەگێڕم تۆ تەنیا نیت.. تۆ خاوەنی ئەم کۆمەڵەیت.. وروژاندن و تەقینەوەی بورکانی خۆشەویستی کامەران و شیعردۆستانی کامەران کانی سەبووری ئێمەیان ژیانەوەو هەمیشە مایەی شەرەف و شانازیمانن.. بە قوربانتان بم..

*ئەم نووسینە چلەی مەرگی شاعیردا لە لایەن ئەستێرەی کچییەوە خوێنرایەوە.

# نیگای بۆچوونێكی نوێو چەند شیعری بڵاونەكراوەی شاعیر

عەبدوڵڵا عەزیز خالد

گەلێ جار مرۆڤ بەو هیوایەوە ئەژی و تێكرای ئەو پرۆژانەی ڕەنگی نەخشەی بۆ كێشاون بەدی بێن و چاوو دڵ و دەروونی خۆی و كۆمەڵگای پێ ڕۆشن كاتەوە ئەشێ تەمەن و باروداۆخ و هەوڵدانێكی سەرومڕ ئەو پرۆژانە یان هەندێكیان بێنێتە كایەوەو یان بیان پێچێتەوەو لولیان بكات و لە خانەی بیرچوونەوەدا بن.. هەر دوای ئامادەكردن و پێشەكی و پەراوێز نووسینی دیوانی "كامەران موكری" كەڵكەڵەی دیوانی شیعریی شیعرەكانی "دیلان"م لا گەڵاڵە بوو.... بەو نیازەی تا هەردوو شاعیر لە ژیاندا ماون شاكاری بەرهەمی ئەدەبی خۆیان ببینن و چاوو دڵیان پێی گەش و ڕۆشن بێتەوەو هەم قەدرزانینی هەوڵ و خزمەتیشان لە لایەن ڕۆڵانی نەتەوەكەی خۆیانەوە لەبەرچاو بێت.

بۆ دیوانی شیعری "دیلان" بەختەوەر بووم و ئاواتەكەم هاتەدی، كەچی داخ بۆ دیوانی شیعرەكانی "كامەران موكری" لەسەر خواستی خۆی بۆ ماوەیەك دواكەوت، تا دوای وەفاتی دەرفەتی بۆ ڕەخسا دیسان ڕوو لە چاپخانە بنێتەوەو ڕێچكەی بەرەوپێشچووی كاروانی شیعری نوێی كوردی بگرێت.. ئەو هۆیە بەهێزو كاریگەرەی هانی دام بۆ نووسینی ئەم پاشبەند پیاچوونەوەی بیروڕاو سەرنجێكی تایبەتی خۆمەو لە نووسین و گفتوگۆكانمدا دوپاتم كردۆتەوەو وتومەو ئەیڵێم: مرۆڤی هۆشمەندو بە ویژدان و خاوەن ڕێبازی زانستی و مەنتیقیانە نابێت لەخۆوەو بێ هیچ بەڵگەو بنچینەیەكی دروست حوكمی ڕەق و كورت بینانە بدات و خەتی ڕاست و چەپ بەسەر ئەم ئەدیب یان ئەو ڕۆشنبیردا بهێنێ بەوەی وشك بۆتەوەو تڵپی تەڕی تیانەماوە سەبارەت بەوەی فلانە وزەو توانای لەو بوارەدا كز بوە یان پرزە بڕاو بوە، حوكمێكی گران و سەختەو خۆی لەبەردەم ڕاستی واقیعی داهاتا ناگرێت، ئەمە كاتێك پڕ بە پێستی قسەكە دەرئەچێت كە مەرگ پەری بە ژیانی ئەو مرۆڤە ئەدیب و ڕۆشنبیرەدا كردبێ و چاڵی مەرگ هەڵی لووشیبێت، بەڵام ئەو حوكمە هەرگیز بۆ مرۆڤێك ڕەوا نییە كە لە ژیاندا مابێت.. بۆ بەڵگەی ڕاستی بۆچوونەكەم، هەڵوەشاندنەوەی ئەو ڕاو بۆچوونانەیە كە سەبارەت "كامەران موكری" كۆچ كردو دەرئەبڕا: ئەوەتا ئێستا دوای ئەوەی مەرگ بۆ باوەشی خۆی پێچایەوەو بۆ یەجگاری ماڵئاوای لێكردین، كۆمەڵێ شیعری بڵاونەكراوەیم چنگ كەوت، هەرچەندە بنەماڵەی ناوبراو دەڵێن: جگە لەم شیعرە بڵاو نەكراوەیەی خاوەنی بەرهەمێكی زۆری شیعری تروەو بە ئەمانەت لای دۆستێكی داینــاوە.. لـــە خوێندنەوەیـــەكی ورد و پیاچوونەوەیەكی هێمنانەیدا هەست بە گوڕو توانای هونەری شیعری كامەران دەكرێت كە نەك هەر درێژی بە ڕێبازەكەی بەر لە ئێستای بێت، بەڵكو بە زەقی سیمای بەرەوپێشچوونی لایەنی هونەروەری شیعری دەكەین، ئەمەو سەرەڕای ئەو ڕاستیەی شیعرەكانی ئەم بەرامبەر بە واتا قوڵ و فراوانی فەلسەفەی ژیانی سەردەم و تاقیكردنەوە تایبەتیەكانی خۆی و دەوروبەرو پەرەپێدان و گۆڕانكاریەكانی ڕۆژگار.

ئەوەتا شاعیر لەم چەپكە شیعرەیدا كە لە ١٩٨٣/١١/٢٣ هۆنیویێتیەوە ئەفەرموێ:

دەرەختێ بووم لە سایەما هەژاران
لە گوێ كانیی دەروونم حەسانەوە
هەتاوێ بووم كە سیرەی خەم و گریان
لە باوەشی نیانما بووژانەوە
كەچی پیریم لە كرێوەی خەفەتا
یا سەبوونی بیابانی مەینەتا
كەسێ نییە، فریای كەوێ بۆ تاوێ
بێ بە سایە، یان بە نەختە هەتاوێ

من بڕوام وایە ژان و ئازارەكانی "كامەران" تەنیا لە خەمی ناخی دەروونی خۆی دەرچوە، مەلێكی سەربەستەو بە دنیای بەرینی نەتەوەكەیدا لە شەقەی باڵ دەدات و خەمخۆری گشتەو هەر بۆیەش خۆی لە كۆمەڵ و كۆمەڵ لە خۆیدا دەبینێتەوە:

تا مەیخانەی خەفەت بە من ئاوابێ
چەرخی خۆشیم شكستە بێ، سوا، بێ
دڵ ئەنێمە بۆتەی سەر گڕو پشكۆ
تا خۆم ئەبم بە ڕووناكی بۆ ئاسۆ

ئەدیبی ڕەسەن و ڕاستگۆ (شاعیر، چیرۆكنووس..) خاوەنی هەستێكی ناسك و شنە بایەكی فێنك، یان گڕەیەكی كز كار لە هەست و هۆشی دەكات.. دەیبزوێنێ، لە ناخەوە دەیهەژێنێ، من ناڵێم تێكرای مرۆڤی هۆشمەندو جگەرسۆز وا نین، بەڵام هیچیان بە ئەندازەی ئەدیب كاریان تێناكات، هەڵوێستە تاڵ و شیرینەكانی ژیانی مرۆڤ بە جۆرێكی ئەوتۆ كار دەكاتە سەر ئەدیبی ڕەسەن و ڕاستگۆ. دنیایەكی یەجگار تایبەتی لا دروست دەكات، ئەندیشەكانی چیای قوچی سەرسەخت و دەریای قولی بیبن پیك دەهێنێ و دەبنە بوار و مەودای قارەمان و چاونەترسان.. كامەرانی شاعیر لەم قەسیدە شیعریەیدا ڕووەو ئەو دنیایەی مەبەستیتی ڕاپیچمان دەكات.. من پیم وایە ئەم قەسیدەیە هیشتا ناتەواوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی سیمایەكی گرنگ و هیمایەكی بەرزو پیرۆزەو بەهرەو دەست ڕەنگینی شاعیر لە پیشەنگی شیعری نویی كوردیدا دەردەخات:

ئەسپە شیی تەمەنی ماندوم لە تونــاو تونا
ویلە بە دوای هەنسكی جەرگی زەبوونا
ئیستە گولی دوانی دڵت سیس و ژاكاوە
بیخی گول بەن لە دەرونی وشك و سوتاوە
چاوی لیلم گیژی ئەدا دیمەنی سزام
شتێ نییە هەرگیز لای من تیابێ نەختێ تام
هاوریم نییە، بزەی دەمیان وەک ژەهری مارە
هاوریم نییە، هاوری خوانن، هاودەمی پارە
كوا، باخەكەی تەكێ و وشەی بەپیزی خامە
كوا ئەو كوڕەو، ئەو وتانە، كوا ئەو پەیامە
هەرچی ئەڵێ كەفی دەمە، خۆت لێی بێبەشی
شەیدای پارەو، نەک عەشقی پاک، تۆ شەیدای لەشی

كامەرانی شاعیر دەوروبەری دەپیوێ، بۆیە ئا بەو جۆرە ئارامی لەبەر هەڵدەگیرێ و گۆزەی دەروونی هەڵدەچێ و تەنانەت

جامی توڕەبوونی پیرۆزی پڕ دەبێت و لە دوا بەیتەکانی هەمان قەسیدە شیعرییەدا ئاوا ڕودەکاتە هەڵویستی ناڕەواو ناهەمواری مرۆڤی چەوت و چەوێڵ:

ئێـــوە دزن دزی ئـــارام، بـــزەی ئـــەم و ئـــەو
ئێـــوە دزن، دزی وەنـــەوز، غونچـــەی شـــینی خـــەو
ئێـــــوە دزن، دزی پـــــــارەو دزی خۆرەتـــــــاو
دزی ســـنگ و بـــەژنی شـــەنگ و نیگـــای گەشـــی چـــاو

شاعیری لێهاتوو دڵسۆز "کامەران موکری" لە قافیەی دوا بەیتی قەسیدەکەدا وشەی "خۆرەتاو، نیگای گەشی چاو" بۆ پارسەنگی قورسایی سەرجەم شیعرەکە داڕشتوە کە لە ڕوی بەرزی واتاو پیرۆزی هەڵویستی مرۆڤانەوە بێ وێنەیەو ڕەنگدانەوەیەکی بێ ڕتوشی واقعی ژیانی کۆمەڵگاکەیەتی.

کامەران لە پارچە کاغەزێکی زەردا لە ١٩٧٩/١٢/١٧دا بە ناونیشانی خەو، چەند وێنەیەکی شیعری جوان جوانی لە سێ دیمەندا نیشان داوین:

-١-

لە خەوتا پەپوولەیە بووم
شەیدای ورشەی نیگای چاوت
ئەخولامەوە بەبێ ئارام لە دەوری ئەگریجەی خاوت
لە خەوتا بوو، باڵی تاسەم ئەخشان لە لێوی پاراوت
ئەشکی شەیدایم ئەڕشتە سەر دڵێ بۆ من سووتاوت
هەزاران شیعرم ئەنووسی لەسەر کوڵمی داگیرساوت

-٢-

تاکەی لە خەوی ناسکا
تەنیا لە باخی هەنسکا
پەپوولەبم
تۆش لە خەوما گوڵ بیو ئاوات
لە دەوری قژت گڕبخوات؟
تاکەی ئەم خەوە گەرمانەت کچەکە بە ڕاست ناگەڕێ
من خەوو ئارام و شیعرم، ئەم دڵە پاکە پاکەشم
بۆ هێنانەدی خەوەکەت.
لە دەوری ئەو خەوەت گەڕێ
شاعیر لە چەند چوارینێکی بەهێزو پێزدا کۆمەڵی وێنەی شیعری پڕ بە ناوەخنی بەرز و پیرۆزمان بۆ دەنەخشێنێ.
هۆنراوەکەت خونچەیەکە وەک دەمت تەنگ
پەڕەیەکە، باڵای وەکو بەژنی تۆ شەنگ
وشەکانی ئاڵە وەکو لێوت ناسک
ئاوێتەیە، لە تریفەو قوڵپی هەنسک
**
کچێکی ڕووت لە سوانیی خۆڕا خوی ئەشوا
تاسەی چاوانی کەوێکە ئەکشێ بەرەو جەرگی نوا
چرایەکە، پەپوولەی دڵ لە دەوری دڵی ئەگەڕێ
ئەو ئاگری قاسپەیەیە لە شەوی خەما ئەگرێ
**
کچە جافێکە لەسەر دڵ خەوی کری لێکەوتووە
شەوبۆیەکە لە پاڵ بەردا خونچەی تازە پشکوتووە
گۆرانی‌یەکە تا ئێستە ئاوازی نی‌یە لەو چەشنە
هۆنراوەکەت بریسکەی ڕوو شل و ملی باڵاو بەژنە

شاعیر لەم کۆپلەیەدا وردە کاریەکی باشی نواندوەو لەسەر هەمان دەستوری چوارینەکانی کارە هونەرییەکەی ئەنجام داوە:
کچی جوان ئەو شیعرەی دوێنێ لەگەڵ بەیان داتە دەستم
کە خوێنمەوە وەکو زنجیر مەچەکی ئارامی بەستم
گڕی بەردا نەک لە مەڵۆ، لە شاراکانی هۆنراوە
هۆنراوەکەت کەژو دەشتە، دارستانەو تاڤگە ئاوە
بەڵام تۆ هۆنراوە مەڵێ چونکە خۆت چەپکە هۆنراوەی
بوونی، ژیان، ئاوات و تاسەی ئەم دڵە سووتاوەی
شاعیر لەم پارچە شیعرەیدا ڕوو لە هەڵویستی ئەو مرۆڤانە دەکات، کە لە ژیاندا هیچیان لەبەرچاو نییەو چەند بەلاو لویاندا بچێت هەر ڕەنج بە "با"یە دڵگرانە بەوەی، کە ئەم بە پاکی خۆی لە گەڵیاندا هەڵویستی نواندوەو گۆرانی عەشقێکی پیرۆزی بۆ وتون، یان بەلای کەمەوە چاوەڕێی چاکەو خێرخواهی بۆ گەلەکەی لێکردون کەچی پێچەوانەی چاوەڕوانی ئەوەوە دەرچون:
بمزانیایە ئاوا ئەبم برای خەم و خەفەت چێژان
باوکی زاروڵەی کەساس و بەسزمان و ئەسرین ڕێژان
نیشتەی ئەشکەوتی ماتەمی و پیشەم بە ژانا هەڵزنان
بمزانیایە ئێوەش ئەمەن دەمی دڕوو دەسی تاوان
دەروون و بیرتان لیخنە لە سەرچاوەداو بناوان
بمزانیایە وتەی پاک و دەروونی پاک و دڵی پاک
هەموو ئەکەن بە قوربانی تەلاروو ئاڵتوون و سامان
شیعرم بۆ ئێوە نەئەوت دڵیشم نەئەکرد بە مۆم
کەمتەرخەمانەو گۆشەگیر وەک ئێستە ئەژیام بۆ خۆم
"کامەران موکری" شاعیر ڕۆڵەی ئەم خاک و خۆڵەیەو جگەرسۆزی ڕۆڵانی نەتەوەکەیەتی، بە دڵێکی پاك و ڕوویەکی گەشەوەو بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە بە هەڵویستی جوامێرانەی خۆی گەردی گومان لەناو نەتەوەکەیدا ناهێڵێ و بەوەش خۆی دەکاتە چاوگی بڕواو متمانەی نەتەوەکەی خۆی.. ئەگەرچی شاعیر هەندێ جار لە ئەنجامی جگەرسۆزی خۆی دەروونی توڕەیی هەڵدەچنی، بەڵام ئەو وتانەی کە لەو ساتەشدا دەریدەبڕی هەر لە پاکی و دڵسۆزیەوەیە، دەنا "کامەران موکری" هەر عاشقە پیرۆزەکەی نەتەوەو خاك و مرۆڤایەتی و ئەم کۆپلە نایابە ڕەنگدانەوەی دوا هەڵویستی ژیانێتی بفەرموون:
وا مەزانە
من ڕووبارم و تۆش سەرچاوەی
کە ڕۆیشتم.. نایەمەوە
یان من گوللەو
تۆ تفەنگی نات بینمەوە
بەڵی گیانە
من باڵندەو تۆش هێلانە
هەرچەند بڕۆم
هەر ناچارم
بێ قەرارم
هەر دێمەوە، هەر دێمەوە
ئەمەو بە هیوام گەر شیعری بڵاونەکراوەی شاعیرم چنگ کەوت، بەرو دوا پێشکەش ئەدیب و ڕۆشنبیرانی کوردی بکەم.. سەرکەوتوبی.

**سەرچاوە:** دیوانی کامەران موکری، پێشەکی نوسین و پەراوێز لێدان: عەبدوڵڵا عەزیز خالید، چاپی یەکەم ١٩٨٨، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری کاروان.

